# بەندایەتی

نووسینی
ئیبنو تەیمیە

وەرگێڕانی
گەیلان سەروچاوەیی





# بەندایەتی

نووسینی: ئیبن تەیمییە

وەرگێڕانی: گەیلان سەروچاوەیی




چاپی یەکەم ٢٠٢٤ز- ١٤٤٥ك





**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەلیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 65

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

\ tafseeroffice

ئامادەکردنی پێڕست - نووسینگەی تەفسیر

اِبْنُ تَيْمِيَّةَ، تَقِيُّ الدِّينِ أَبُو الْعَبَّاسِ أَحْمَدُ بنُ عَبْدِ الْحَلِيمِ بنِ عَبْدِ السَّلَامِ النُّمَيْرِيُّ الْحَرَّانِيُّ

بەندایەتی ، ئیبن تەیمییە (نووسەر)، گەیلان سەروچاوەیی (وەرگێڕ)

١٢٨ لاپەڕە

١٧* ٢٤ سم

بابەت: ئایینی، عەقیدە

ISBN: 978-9922-733-04-3

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٩٩١)ی ساڵی (٢٠٢٣)ی پێدراوە.


"بیروبۆچوونی ئەم کتێبە، مەرج نییە هەمان بیروبۆچوونی نووسینگەی تەفسیر بێ"


دیزاین: نووسینگەی تەفسیر

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وبه نستعين

إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّه، نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّه مِـنْ شُرُورِ أَنْفُسِـنَا وَمِـنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَـادِيَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

أَمَّا بَعْدُ:

پرسیارکرا لە شێخی ئیسلام "ئیبن تەیمییە" زانای دیاری ناوزانایان، سەرخەر و بڵندکاری سوننەت، سەرکوتکەر و داپڵۆسێنەری بیدعە "احمد عبد الحليم ابن تيمية" (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی ئەو ئایەتەی کە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ﴾ واتا: (ئەی خەڵکینە پەروەردگاری خۆتان بپەرستن) [سورەتی بەقەرە: ٢١].

جا پرسیاری لێ دەکەن کە:

عیبادەت چییە؟

بەشەکانی عیبادەت چین؟

ئایا کۆی دین هەموو عیبادەتی لەخۆ گرتووە یان نا؟

ئایا حەقیقەتی بەندایەتی چۆنە؟

ئایا بەندایەتی بەرزترین پلەیە لە دونیا و قیامەتدا؟ یان شتێکی تر هەیە لە سەرووی پلەی عیبادەت؟

ئیبن تەیمییە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) وەڵام دەداتەوە.

## دەروازە

الْعِبَادَةُ هِيَ اسْمٌ جَامِعٌ لِكُلِّ مَا يُحِبُّهُ اللَّهُ تَعَالَى وَيَرْضَاهُ مِنَ الْأَقْوَالِ وَالْأَعْمَالِ الْبَاطِنَةِ وَالظَّاهِرَةِ، والبراءة مما ينافي ذلك ويضادّه" واتا: "عیبادەت ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو ئەو گوفتار و کردارە ڕووکەش و نادیارانەی کە خوای گەورە خۆشیانی دەوێت و پێی ڕازییە و خۆبەریکردنیش لەو شتانەی کە دژ و پێچەوانەیەتی".

چ کردەوە بێت، چ گوفتار بێت، ئەم کردار و گوفتارە چ لە ناوەوەی مرۆڤەوە بێت، چ لە ڕووکاری دەرەوەی مرۆڤەوە بێت، وەکوو نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج و ڕاستگۆیی و ئەمانەتپارێزی و چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوک و جێبەجێکردنی خزمایەتی، پابەندبوون بە وەعد و بەڵێن، فەرمانکردن بە چاکە، ڕێگریکردن لە خراپە، جیهادی کافر و مونافیق، چاکەکردن لەگەڵ جیران، چاکەکردن لەگەڵ یەتیم، چاکەکردن لەگەڵ هەژار، چاکەکردن لەگەڵ ڕێبوار، چاکەکردن لەگەڵ مرۆڤەکان، چاکەکردن لەگەڵ ئاژەڵان و بە ڕەحمبوون بەرانبەریان، دوعاکردن، زیکرکردن، قورئانخوێندن، هەموو ئەمانە و هاوشێوەی ئەمانەش بریتین لە عیبادەت کە خوا پێی خۆشە و لێیان ڕازییە. هەروەها خۆشەویستیی خودا و پێغەمبەری خوا ﷺ و، ترسان لە خودا و گەڕانەوە بۆ لای خودا و، بوونی ئیخلاس بۆ خوای پەروەردگار و، ئارامگرتن لەسەر بڕیارەکانی خودا (قەزا و قەدەر) و، سوپاسگوزاری لەسەر نیعمەتەکانی خوا و، ڕازیبوون بە قەدەر و قەزای خودا و، پشتبەستن بە پەروەردگار و، ڕەجا و تەمابوون بە خودا و ترس لە سزای خودا، هەموو ئەمانە و هاوشێوەی ئەمانە بریتین لە عیبادەت، کە خودا پێی خۆشە و لێیان ڕازییە.

بۆیە عیبادەتی پەروەرگار ئەو ئامانجە گەورەیە کە هەم بە لای پەروەردگار خۆشەوستە، هەم تۆش دەکات بە خۆشەویستی پەروەردگار و، هەم پەروەردگار لێی ڕازییە و هەم پەروەردگار لێی ڕازی دەبێت. عیبادەت ئەو ئامانجە مەزن و سەرەکییەیە کە پەروەردگار هەموو مەخلوقاتی لەپێناودا دروست کردووە. وەکوو پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ واتا: (بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن) [سورەتی زاریات: ٥٦].

هەموو پێغەمبەرانی بۆ ئەم مەبەستە ناردووە کە عیبادەتی پەروەردگار بکەن. هەروەکوو پێغەمبەر "نوح" بە قەومەکەی دەفەرمووێت:

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ﴾ واتا: (سوێند بە خوا بەڕاستی ئێمە "نوح"ـمان ڕەوانە کرد بۆ سەر قەومەکەی، جا ئەویش پێی وتن: ئەی گەل و هۆزم ئێوە هەر خوا بپەرستن، چونکە جگە لەو زاتە خوایەکی ترتان نییە.) [سورەتی ئەعراف: ٥٩].

جگە لەوانیش پێغەمبەرانی تریش ئەم پەیامەیان بە قەومەکەیان گوتووە لە (هود، سالح، شوعەیب، موحەممەد ...) پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ﴾ واتا: (سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووە و پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورەپەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر، جا هەبوو لەو خەڵکە کە بیر و هۆش و ژیریی خۆی خستەکار و بە شوێن ڕاستیدا دەگەڕا و خوایش هیدایەتی دەدات، هەشیان بوو خۆی شایستەی گومڕایی دەکرد و بەسەریدا دەچەسپا) [سورەتی نەحل: ٣٦].

وە دەفەرمووێت:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴾

واتا: (ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە، کە وەحیمان بۆ نەناردبێت بەوەی کە: بێگومان هیچ خوایەک نییە جگە لە من و دەبێت هەر من بپەرستن) [سورەتی ئەنبیا: ٢٥].

پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴾

واتا: خەڵکینە! بە ڕاستی ئەم ئایینەی کە ئەم پێغەمبەرانە هێناویانە ئایینەکەی ئێوەیە، کە یەک ئایینە و منیش پەروەردگارتانم، تەنها من بپەرستن). [سورەتی ئەنبیا: ٩٢].

لە ئایەتی تردا دەفەرمووێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ * وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱتَّقُونِ ﴾ واتا: ئینجا وتمان: ئەی گرۆی پێغەمبەران، بخۆن لە ڕزقوڕۆزییە چاك و پاکەکان، کاروکردەوەی چاکیش ئەنجام بدەن، بە ڕاستی من زانام بە هەموو ئەو کاروکردەوانەی کە دەیکەن * هەر ئەمەشە دین و ئایین و بەرنامەی تاک و تەنهای ئێوە، بەرنامەی یەکخواناسی و من پەروەردگارتانم، پارێزکار بن و خۆتان لە نافەرمانیی من بپارێزن. [سورەتی مؤمینون: ٥١، ٥٢].

پەروەردگار بەندایەتیی واجب کردووە لەسەر پێغەمبەرەکەی تاوەکوو مردن. وەکوو دەفەرمووێت: ﴿ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ﴾ واتا: بەردەوامیش پەروەردگارت بپەرستە هەتا مردن یەخەت پێ دەگرێت، ئەو کاتە ئیتر بەیەك جاری ڕزگارت دەبێت لە هەموو ناخۆشییەکان. [سورەتی حەجر: ٩٩].

بەمەش وەسفی مەلائیکە و پێغەمبەرانی کردووە و دەفەرمووێت:

﴿ وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَنۡ عِندَهُۥ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَلَا يَسۡتَحۡسِرُونَ * يُسَبِّحُونَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفۡتُرُونَ ﴾ واتا: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هەر خوا خاوەنیانە و لە خزمەتی ئەودان، بێگومان ئەو فریشتانەی کە لە خزمەتیدان، خۆیان بە گەورە نازانن لە پەرستنیدا و هەرگیز ماندوو و بێتاقەت و بێزار نابن لە ستایشی ئەو زاتە. بەردەوام بە شەو و بە ڕۆژ تەسبیحات و ستایشی دەکەن لە کاتێکدا ساردبوونەوەش ڕوویان تێ ناکات. [سورەتی ئەنبیا: ١٩، ٢٠].

دەفەرمووێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسۡجُدُونَ ﴾ واتا: بە ڕاستی ئەوانەی لای پەروەردگارتن خۆیان بە گەورە ناگرن لە پەرستنی ئەو زاتەدا و بەردەوام تەسبیحات و ستایشی دەکەن و سوجدە و کڕنووشی بۆ دەبەن، حەق وایە سەرجەم ئادەمیزادەکانیش چاو لەوان بکەن. [سورەتی ئەعراف: ٢٠٦]. پەروەردگار زەمی ئەو کەسانە دەکات کە لە بەرانبەر عیبادەت و بەندایەتی خۆیان بە گەورە دەزانن

﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴾ واتا: (ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هانا و هاوار بۆ من بهێنن، ئەوە من دوعا و نزاتان گیرا دەکەم، بە ڕاستی ئەوانەی خۆیان بە گەورە دادەنێن و لووتبەرزی دەکەن لە ئاستی

پەرستنی مندا، لە ئاییندەدا بە سەرشۆڕی و خەجاڵەتییەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.) [سورەتی غافر: ٦٠].

پەروەردگار وەسفی بەندە هەڵبژێردراوەکانی دەکات بە وەسفی عبودییەت بەوەی ئەوانە خاوەنی بەندایەتین بۆ خوا ﴿ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا ﴾ واتا: (کە کانییەکە بەندەکانی خوا لێی دەخۆنەوە لە هەر شوێنێکدا بیانەوێت هەڵی دەقوولێنن و فوارە دەکات). [سورەتی ئینسان: ٦].

دەفەرموویت: وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴾ واتا: (بەندەکانی خوای میهرەبان ئەو کەسانەن کە زۆر بە هێمنی و سەلاری بەسەر زەویدا دەڕۆن، کاتێکیش نەفامان بە قسە و قسەلۆکی ناخۆش بەرەنگاریان دەبن، لە وەڵامیاندا دەڵێن: سڵاو، ڕەوشتبەرزیی خۆیان دەنوێنن). [سورەتی فورقان: ٦٣]. کاتێک شەیتان سوجدەی نەبرد بۆ ئادەم، فەرمـــووی: رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ * إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾

واتا: پەروەردگارم، مادەم بە هۆی ئەم مرۆڤەوە منت سەرلێشێواو کرد، شەرت بێت لە زەویدا هەموو گوناهـ و لادان و تاوانێکیان لا جوان و شیرین بکەم و هەر هەموویان سەرلێشێواو و سەرگەردان بکەم. بێجگە لە بەندە پوختە و دڵسۆزەکانی خۆت نەبێت، چونکە دڵیان بە باوەڕ بە تۆ و یادی تۆ ئاوەدانە، هەوڵ و کۆششی من بۆ وێڵکردنیان ناکامە. [سورة الحجر: ٣٩-٤٠].

وە دەفەرموویت:

﴿ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴾ واتا : بە ڕاستی بەندە چاك و پاکەکانی من بە تۆ فریو نادرێن و تۆ هیچ دەسەڵاتێکت نییە بەسەریاندا، جگە لەوانەی کە شوێنت کەوتوون لە سەرکەش و یاخی و سەرگەردانەکان. [سورة الحجر: ٤٢].

پەروەردگار لە وەسفی مەلائیکەدا دەفەرمووێت:

﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۚ بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ * لَا يَسۡبِقُونَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ وَهُم بِأَمۡرِهِۦ يَعۡمَلُونَ * يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ وَهُم مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ مُشۡفِقُونَ﴾واتا: (خوانەناسان دەیانوت: خوای میهرەبان کوڕی بۆ خۆی بڕیارداوە (فریشتەکان ڕۆڵەی ئەون)، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەیە، بەڵکوو ئەوانە بەندەی ڕێزداری ئەون. ئەو فریشتانە ئەوەندە ڕەوشت بەرزن) هەرگیز (نافەرمانیی ناکەن و) قسە لە قسەیدا ناکەن و لە گوفتاردا پێشی ناکەون، ئەوانە بە فەرمانی ئەو دەجووڵێنەوە و فەرمانی ئە جێبەجێ دەکەن. هەر خوا دەزانێت ئەو خەڵکە لە ڕابردوودا چییان ئەنجام داوە و لە داهاتووشدا چی ئەنجام دەدەن (دونیا و قیامەت، ڕابردوو و داهاتوو، بۆ ئەو زاتە چوونیەکە)، فریشتەکانیش تکاکار نابن تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت خوا پێی ڕازییە و ئەو فریشتانە لە ترسی ئەو زاتە ناوێرن هیچ سەرپێچییەک ئەنجام بدەن). [سورة الأنبياء: ٢٦-٢٨].

وە دەفەرمووێت:

﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗا ۝ لَّقَدۡ جِئۡتُمۡ شَيۡـًٔا إِدّٗا ۝ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِنۡهُ وَتَنشَقُّ ٱلۡأَرۡضُ وَتَخِرُّ ٱلۡجِبَالُ هَدًّا ۝ أَن دَعَوۡاْ لِلرَّحۡمَٰنِ وَلَدٗا ۝ وَمَا يَنۢبَغِي لِلرَّحۡمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ۝ إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا ۝ لَّقَدۡ أَحۡصَىٰهُمۡ وَعَدَّهُمۡ عَدّٗا ۝ وَكُلُّهُمۡ ءَاتِيهِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَرۡدًا﴾

واتا: (جوولەکە و گاور و بتپەرستان) دەیانوت: خوای میهرەبان ڕۆڵە و نەوەی بۆ خۆی داناوە!! سوێند بە خوا بە ڕاستی بوختانێکی ناقۆڵا دەکەن و گوفتارێکی ناشایستە و سەرسوڕهێنەر دەڵێن. خەریکە ئاسمانەکان لە ناقۆڵاییی

ئەو گوفتارە نابەجێیە لەت و پەت ببێت، زەوی خەریکە شەق بەرێت و ڕۆ بچێت، کێوەکانیش خەریکە بکەون و ورد و خاش ببن. کاتێک کە نەفامان بوونی ڕۆڵە و نەوەیان دایە پاڵ خوای میهرەبان. لە کاتیکدا بۆ خوای میهرەبان نەهاتووە و ڕەوا نییە کە نەوە بۆ خۆی بڕیار بدات. هیچ کەسێک نییە لە ئاسمانەکان و زەویدا، کە بەندەی ملکەچی خوای میهرەبان نەبێت. سوێند بە خوا بێگومان هەر هەموویانی سەرژمێر کردووە و یەک یەک ژمارەی کردوون (کەسی لێ ون نابێت)، هەر هەموویان ڕۆژی قیامەت دێنە پێشەوە، بۆ لای بە تاک و تەنها (بێ پاسەوان و بێ کەس). یەکە یەکەی ئەو خەڵکە بە تاک و تەنهایی دێت و ئامادە دەکرێت لە بەردەم دادگای پڕ لە دادوەریی خوادا. [سورة مريم: ٨٨-٩٥]

ئەو مەسیحەی کە بانگەشەی خوایەتی و پێغەمبەرایەتیی بۆ کرا، پەروەردگار دەربارەی دەفەرمووێت:

﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا عَبۡدٌ أَنۡعَمۡنَا عَلَيۡهِ وَجَعَلۡنَٰهُ مَثَلٗا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾

واتا: ئەو عیسایە تەنها بەندەیەکی ئێمە بوو کە نازونیعمەتی پێغەمبەرایەتیمان پێ بەخشی و کردمانە نموونەیەکی چاك بۆ نەوەی ئیسرائیل تا شوێنی بکەون. [سورة الزخرف: ٥٩].

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: «لَا تُطْرُونِي كما أَطْرَتِ النَّصَارَى ابْنَ مَرْيَمَ، فإنَّما أَنَا عَبْدُهُ، فَقُولوا: عبدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ» [1] واتا: (زیادەڕەوی مەکەن لە مندا، هەروەکوو چۆن زیادەڕەوی کرا لە عیسای کوڕی مەریەم، جا من بەندەی خوام و ئێوەش بڵێن بەندەی خوا و نێردراوی خوا).

خوا پێغەمبەرەکەی وەسف کردووە بە "العبودية" لە تەواوترین و کامڵترین حاڵی پێغەمبەردا و لە پیرۆزترین شوێندا کە "میعراج" بوو، وەکوو لە سوڕەتی "ئیسرا" دەفەرمووێت: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا﴾ واتا: (پاکی و

(١) صحيح البخاري: ٣٤٤٥

بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەی کە شەوڕەویی کرد لە بەشێکی کەمی شەودا). [سورة الإسراء: ١].

لە کاتی دابەزینی "وەحی"دا دەفەرمووێت:

﴿ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴾ واتا: (ئینجا خوا لە ڕێگەی ئەوەوە، نیگای کرد بۆ بەندەی خۆی، ئای چ نیگایەک بوو!) [سورة النجم: ١٠].

لە کاتی "بانگەواز"دا دەفەرمووێت:

﴿ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ﴾

واتا: (جا کاتێکیش بەندەی خوا محمد بانگەوازی بۆ شوێنکەوتنی بەرنامەی خوا دەکرد (ئەو خەڵکە بە دەستەی ئادەمیزاد و پەرییەوە) خەریک بوو لەناوی بەرن (نووری خوا بکوژێننەوە). [سورة الجن: ١٩].

لە کاتی مەیدانخوازیدا (تەحەددا) دەفەرمووێت:

﴿ وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ ﴾

واتا: (جا ئەگەر ئێوە لە دوودڵیدان و گومانتان لەم قورئانە پیرۆزە هەیە کە دامانبەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان محمد ئەگەر بۆتان دەکرێت ئێوەش هەوڵ بدەن سوڕەتێکی وەك ئەو بهێنن). [سورة البقرة: ٢٣].

# دین هەمووی لەناو عیبادەتدایە (١)

لە فەرمـوودەیەکی "صحیح"ـدا جێگیـر بـووە، کاتێـک جوبریـل هـات بـۆ لای پێغەمـبەری خـوا ﷺ لە شێوەی کەسێکی دەشتەکی، پرسیاری لە پێغەمـبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ئیسلام، فەرمووی: «یا محمد، أخبرني عن الإسلام» واتـا: ئەی محمد ئیسلام چییە؟ پێغەمبەریش فەرمووی: «الإسلام: أن تشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله، وتقيم الصلاة، وتؤتي الزكاة، وتصوم رمضـان، وتحـج البيت إن استطعت إليـه سـبيلا.» واتـا: ئیسلام ئەوەیە شایەتی بدەیت کەوا هیچ پەروەردگارێـک نییە بە حەق تەنها الله نەبێت، محمدیش پەیامبەری خودایە و، نوێژ بکەیت و زەکات بدەیت و مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بیت، حەج بکەیت ئەگەر توانیت.

پاشان لە پێغەمبەری خودا ﷺ دەپرسێت: «فأخبرني عن الإيمان» واتـا: ئەی ئیمان چییە؟ پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: «أن تـؤمن باللـه، وملائكتـه، وكتبه، ورسله، واليوم الآخر، وتؤمن بالقدر خـيره وشره» واتـا: باوەڕت هەبێت بە خوا و بە فریشتەکانی و بە کتێبەکانی و بە پێغەمبەرانـی و، باوەڕیشت بە قەدەر هەبێت جا قەدەرەکە خێر بێت یان شەڕ بێت.

پاشان لە پێغەمبەری خودا ﷺ دەپرسێت: «فأخبرني عن الإحسان» ئەی چاکەکردن چییە؟ پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: «أن تعبد الله كأنك تراه،

---

(١) ئەوە وەڵامی ئەو پرسیارەیە کە لە "ئیبن تەیمییە" کرا، بە ناونیشانی: ئایا کۆکراوەی دین لەناو عیبادەتدایە یاخود نا؟

فإن لم تكن تراه فإنه يراك» واتا: خوا بپەرستی وەکوو ئەوەی ببیبنیت، ئەگەر تۆش ئەو نەبینیت ئەو تۆ دەبینێت.

لە کۆتاییی فەرموودەکەدا پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: «فإنه جبريل أتاكم يعلمكم أمر دينكم» [1] واتا: ئەمە جوبریل بوو هاتبوو فێری ئایینەکەتان بکات.

جا پێغەمبەری خودا هەموو ئەو شتانەی لەو فەرموودەیەدا باس کران بە دینی دانان. دین ئەوەیە: مانای زەلیلی و ملکەچی بۆ خودا لەخۆ گرتبێت. بۆ نموونە دەگوترێت: "دِنْتـه، فـدانَ" واته: "ذَلَّلْتُـهُ فَـذَلَّ" گەردنم پێ کەچ کرد و ئەویش گەردنی کەچ کرد. کاتێک دەگوترێت: "يَدينُ للَّهَ ويَدينُ للَّهِ" واتە: (خواپەرستی و گوێڕایەڵی دەکات و گەردنی بۆ کەچ دەکات).

دینـی خـوا: عیبـادەت و گـوێڕایەڵی و زەلیلـی و گەردنکەچیـیە بـۆ خـوا. کرۆکـی مانـای عیبـادەت گەردنکەچـی و زەلیلیـیە بـۆ پەروەردگـار. کاتێـک دەگوترێت: "طريق معبَّد" ڕێگەی پەرستگە کە ڕێگەکە تەخت و زەلیـل و کەچ بوو بێت بە هۆی زۆر بەسەردا ڕۆیشتن و ژێرپێکەوتن تەپی بێت.

ئەو عیبـادەتەی کە فەرمـانی پـێ کـراوە لە لایەن خـوای پەروەردگـار هەردوو مانـای زەلیلی و خۆشەویستی لەخۆ دەگرێت. بەوپەڕی زەلیلی و خۆشەویستی عیبادەت بۆ خوا دەکرێت.

کۆتـا قۆنـاغی خۆشەویستی: بـریتییە لە "تەتەیـوم" تـوانەوە لە خۆشەویـستیدا، یەکەم قۆنـاغی: بـریتییە لە "پەیوەنـدی" واتە پەیوەسـتبوونی دڵ بە خۆشەویـست، قۆناغی دوای ئەو قۆناغی "الصَّـبابَةُ" ـیە، چونکە دڵ پێیەوە دەلکێت و مەیلی زۆری بـۆ هەیە. قۆنـاغی دوای ئەو قۆنـاغی "غەرامە" ئەو خۆشەویـستییەیە کە

---

(٣) أخرجه مسلم، كتاب الإيمان، باب بيان الإيمان والإسلام والإحسان ووجوب الإيمان بإثبات قدر الله سبحانه (١/٣٦)، رقم: (٨).

هەمیشە بە دڵەوە لکاوە و لێی جیا نابێتەوە، قۆناغی دوای ئەو "عیشق" دێت و کۆتا قۆناغ قۆناغی "تەتەیومە" توانەوە و شەیدابوون لە خۆشەویستیدا. کاتێک دەگوترێت: "تَـيْمُ للّـهِ" واتە: "بەندەی خوا".. کەسی تەتەیوم ئەو کەسەیە کە عیبادەتی خۆشەویستەکەی دەکات و دڵی تەواو تەواو پەیوەست بووە پێی.

هەر کەسێک گەردنی کەچ کرد بۆ کەسێک، لە کاتێکدا ڕقی لەو کەسەیە و دڵی خۆشی ناوێت، ئەوا ئەو کەسە نابێتە عابدی ئەو کەسە. ئەگەر کەسێک شتێکی خۆش بووێت و ملکەچی و گەردنکەچی ئەو شتە نەبێت، ئەوا نابێتە عابدی ئەو شتە، هەروەکوو خۆشویستن بۆ منداڵ و هاوڕێ. لەبەر ئەوە یەکێکیان بەس نییە بۆ ئەوەی خوای پێ بپەرسترێت.

بۆیە پێویستە خودا لای عەبد لە هەموو شتێک خۆشەویستتر بێت، خوای لە هەموو شتێک بە لاوە گەورەتر بێت، هیچ شتێک شایستەی خۆشەویستیی ڕەها و ملکەچی و زەلیلیی ڕەها نییە، ئیللا خوا نەبێت.

هەر شتێک جگە لە خوا خۆشویسترا، خۆشەویستییەکی خراپ و هیچە، هەر شتێک بە گەورە دانرا کە شەرعی خودا بە گەورەی دانەنابێت، ئەوا بە گەورەدانانێکی پووچ و بێبنەمایە. خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾

واتا: ئەی محمد پێیان بڵێ: ئەگەر باب و باپیرانتان و براکانتان و هاوسەرانتان و عەشیرەت و هۆزتان و ماڵ و سامانێک کە بە دەستتان هێناوە، یاخود بازرگانییەک دەترسن کە شکان و بێبازاڕی ڕووی تێ بکات و خانووبەرە و کۆشک و تەلارێک کە حەز دەکەن لێتان تێک نەچێت و دڵخۆشن پێی، لاتان خۆشەویستتر و نازدارتر بێت لە خوا و پێغەمبەرەکەی و جیهاد و تێکۆشان لەپێناو

ڕێبازی ئەو زاتەدا، دە ئەوە چاوەڕوان بن، هەتا خوای گەورە دێت بە فەرمانەکانییەوە و (تۆڵەتان لێ دەسێنێت)، خوای پەروەردگاریش هیدایەت و ڕێنموویی قەومی یاخی و لە سنووردەرچوو نادات. [سورەتی تەوبە: ٢٤].

خۆشەویستی دەبێت بۆ خوا و پێغەمبەری خودا بێت وەکوو گوێڕایەڵی، گوێڕایەڵیکردن دەبێت تەنها بۆ خودا و پێغەمبەری خودا بێت، پێویستە تەنها خودا و پێغەمبەری خودا لە خۆت ڕازی بکەیت.

﴿ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ أَن يُرۡضُوهُ ﴾ واتا: لە کاتێکدا کە حەق وایە خوا و پێغەمبەرەکەی ڕازی بکەن. [سورەتی تەوبە: ٦٢].

بەخشینتان دەبێت تەنها بۆ خوا و بۆ پێغەمبەری خودا بێت. ﴿ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ رَضُواْ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ﴾ واتا: خۆ ئەگەر ئەوانە ڕازیبوونایە بەو بەشەی خوا بە نسیبی کردوون و پێغەمبەر پێی بەخشیون. [سورەتی تەوبە: ٥٩].

بەڵام عیبادەت و ئەوەی لە عیبادەتەوە نزیک بێت وەکوو پشتبەستن بە خودا و ترسان لە خودا و نموونەی ئەوانەش...، دەبێت تەنهاوتەنها بۆ پەروەردگاری تاک و تەنها بێت. وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿ قُلۡ يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُولُواْ ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ﴾

واتا: ئەی محمد بڵێ: ئەی ئەوانەی کتێبتان بۆ ڕەوانەکراوە وەرن بەدەم بانگەواز و بەرنامەیەکەوە کە هاوبەش و هاوسەنگە لەنێوان ئێمەش و ئێوەشدا (ئەویش ئەمەیە): جگە لە (الله) کەسی تر نەپەرستین، هیچ جۆرە هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەین، هیچ لایەکمان لاکەی ترمان (بە پیرۆز و فەرمانڕەوا دانەنێین) لە جیاتیی ئەو زاتە نەیپەرستین (خۆ ئەگەر لەم بانگەوازدا) سەرپێچییان کرد و

گوێیان پێ نەدا، ئەوە پێیان بڵێ: کە ئێوە بە شایەت بن کە ئێمە موسڵمانین و ملکەچی فەرمانی پەروەردگارین. [سورة آل عمران: ٦٤].

دەفەرمووێت: وَلَوۡ أَنَّهُمۡ رَضُواْ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤۡتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴾ واتا: خۆ ئەگەر ئەوانە ڕازیبوونایە بەو بەشەی خوا بە نسیبی کردوون و پێغەمبەر پێی بەخشیون و بە دڵ بیانوتایە: خوامان بەسە (کە لێمان ڕازی بێت)، ئێمە فەرامۆش ناکات لە ئاییندەدا هەر پێمان دەبەخشێت لە فەزڵ و زیادەڕێزی خۆی، پێغەمبەرەکەشی لەوەی دەستی دەکەوێت پێمان دەبەخشێت، بە ڕاستی ئێمە ئاوات و مەبەستمان گەڕانەوەیە بۆ لای خوا و بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی ئەوە (ئەو کاتە پاداشتی هەردوو جیهانییان بۆ خۆیان مسۆگەر دەکرد). [سورەتی تەوبە: ٥٩].

ئەوەی خوا و پێغەمبەری خودا پێتان دەدات وەکوو پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ ﴾ واتا: ئەو دەستکەوتانەی خوا بەخشیی بە پێغەمبەرەکەی لە خەڵکی دێهات و شارەکانی جوو، ئەوە خوا بڕیاری لەسەر داوە کە بۆ پێغەمبەر و خزمانیەتی، بۆ هەتیوان و هەژاران و ڕێبوارانیشە، بۆ ئەوەی ئەو سامانە تەنها لەنێوان دەوڵەمەندەکانی ئێوەدا نەبێت، جا ئەوەی پێغەمبەر پێی بەخشیون وەری بگرن، هەر فەرمانێکی پێدان بە گوێی بکەن، قەدەغەی هەر شتێکی لێ کردن مەیکەن. [سورة الحشر: ٧].

سەبارەت بە "حەسب" بریتییە لە "بەسبوونی خوا". وەکوو پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنًا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ﴾ واتا: ئەوانەی کە خەڵکی (باوەڕ لاواز) پێیان دەڵێن: بە ڕاستی خەڵکی بێباوەڕ و خوانەناس خۆیان بۆ ئێوە کۆکردووەتەوە و خۆیان بۆ ئێوە مەڵاس داوە، لێیان بترسن (خۆتان تووشی بەڵا

مەکەن) بەڵام ئەوان (واتە ئیمانداران بەو پڕوپاگەندەیە) باوەڕیان زیاتر دامەزراوتر دەبێت، وتیان: خوامان بەسە کە یاریدەدەر و یارمەتیدەرێکی چاکە. [سورة آل عمران: ١٧٣].

دەفەرمووێت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ حَسْبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ و اتا: ئەی پێغەمبەر تەنها خوا بەسە بۆ خۆت و ئەوانەی شوێنت کەوتوون لە ئیمانداران کە پشتگیر و یاریدەدەرتان بێت. [سورة الأنفال: ٦٤].

واتە بەسە بۆ تۆ و بۆ ئەو ئیماندارانەی کە لەگەڵ تۆدان کە خودا وەکیل و پارێزەرتان بێت. هەر کەسێک وا گومان ببات کە واتای ئەو ئایەتە بەو جۆرەیە: (ئەی محمد، خودا و ئەو ئیماندارانەی لەگەڵ تۆدان بەسە پشتیوانی تۆ بن) ئەوا بە ڕاستی هەڵەیەکی زۆر گەورە و خراپی کردووە، هەروەکوو لە شوێنەکانی تر باسمان لەو بابەتە کردووە.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ﴾ واتا: مەگەر خوا بەس نییە کە پشتیوان بێت بۆ بەندەی خۆی کە پێغەمبەرە. [سورة الزمر: ٣٦].

مانای عابد: عابد کەسێکە خوا کردوویەتی بە عەبدی خۆی و گەردنی پێ کەچ کردووە بۆ خۆی و کاروکردەوەکانیشی پەروەردگار بەڕێوەی دەبات.

بەو ئیعتیبارە هەموو دروستکراوەکان بەندەی پەروەردگارن: چاکەکان و خراپەکان، ئیمانداران و بێباوەڕان، بەهەشتییەکان و دۆزەخییەکان، خوای پەروەردگار خاوەنی هەموویانە، دەسەڵاتداری هەموویانە، لەژێر ویست و هێزی پەروەردگار دەرناچن. لەژێر کەلیمە تەواوەکانی خودا، کە هیچ چاکەکارێک و خراپەکاریک لێی تێناپەڕێ.

هەرچی خودا بیەوێت ببێت، ئەوا دەبێت ئەگەر هەموو دروستکراوەکانیش بیانەوێت نەبێت. هەرچی خودا نەیەوێت ببێت، ئەوا نابێت ئەگەر هەموو دروستکراوەکانیش بیانەوێت ببێت. وەکوو پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿ أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ ﴾

واتا: ئایا ئەوانە بێجگە لە ئایینی خوا ئایینێکی تریان دەوێت؟! لە کاتێکدا کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە بە ڕەزامەندی بێت یان بە ناچاری تەسلیم و ملکەچی پەروەردگارن، هەمووانیش هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە. [سورة آل عمران: ٨٣].

خودا خاوەنی هەموو جیهانییانە و دروستکار و ڕۆزیدەریانە و دەیانژیێنێت و دەیانمرێنێت و، ئاڵوگۆڕ بە دڵەکانیان دەکات و خودا ئاڵوگۆڕی بە کاروباریان و حاڵیان دەکات، هیچ پەروەردگارێکیان نییە جگە لە خوا، جگە لە پاشا و خاوەن دەسەڵاتی خود هیچ پاشا و خاوەن دەسەڵاتێکی تریان نییە، هیچ بەدیهێنەرێکیان نییە جگە لە خوا، ئەگەرچی ئەوان دان بنێن بەوەدا یان ئینکاری بکەن. ئەگەرچی بزانن یان نەیزانن، بەڵام ئەهلی ئیمان ئەوە باش دەزانن و دانیان پێداناوە کە خودا ڕازق و مالیک و بەدیهێەری تاک و تەنهایە، بە پێچەوانەی ئەوانەی کە نەزانن بەو بابەتە، یان کەسێک کە ئینکاری دەکات و خۆی بە گەورە دەزانێت و ملکەچی پەروەردگار نییە، لە کاتێکدا زانستی هەیە بەوەی خودا خاڵق و خاوەنیەتی.

زانینی حەق لەگەڵ خۆبەزلزانی وا لە خاوەنەکەی دەکات ئینکار بێت و دان نەنێت بە حەق، ئەمەش دەبێتە عەزاب و ئێش و ئازار بۆی.

﴿ وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ واتا: جا ئەوانەی هەر ڕقنەستووربیان کرد و باوەڕیان پێی نەبوو، بە زۆرداری و خۆبەزلزانی، لە کاتێکدا لە ناخی دەروونیانەوە هەستیان دەکرد حەقیقەتە و ڕاستە، دە تەماشا بکە و سەرنج بدە بزانە سەرەنجامی تاوانباران و گوناهکاران چۆن بوو (چۆن تۆڵەمان لێ سەندن). [سورة النمل: ١٤].

﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾ واتا: ئەوانەی کتێبمان پێ بەخشیون پێغەمبەر دەناسن هەروەك چۆن نەوەکانی خۆیان دەناسن، بێگومان دەستەیەك لەوان ئەو ڕاستییە دەشارنەوە، لە کاتێکدا دەشزانن محمد فرستادەی خوایە [سورة البقرة: ١٤٦].

﴿ قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴾ واتا: بە ڕاستی چاک دەزانین کە گوفتاری نادروستی خوانەناسان غەم و پەژارەت بۆ پێش دەهێنێت، چونکە بە ڕاستی ئەوانە وەنەبێت تۆ بە درۆزن بزانن، بەڵکوو ستەمکاران هەر دان نانێن و ئینکاریی ئایەت و فەرمانەکانی خوا دەکەن. [سورة الأنعام: ٣٣].

ئەگەر بەندە دانی نا بەوە کە خوا خاوەن و دروستکراوی ئەوە و ئاتاجی پەروەردگاری بوو، ئەوا ئەو پەرستنە دەناسێت کە پەیوەستە بە ڕبووبییەتی خوا، بەندە کە ئەمەی زانی، داوا بەس لە خوا دەکات، تەنها ناڵە و هاواری دەباتە لای خوا و، تەنها پشت بە خوای پەروەردگار دەبەستێت، بەڵام هەندێك جار فەرمانەکانی خودا جێبەجێ دەکات و هەندێک جار شەیتان دەپەرستێت.

جا وێنەی ئەم پەرستنە جیاوازی ناکات لەنێوان ئەهلی بەهەشت و ئاگردا، لەسەر ئەم جۆرە عبودییەتە پاداشت نییە و، بەمەش خەڵکی نابێت بە ئیماندار. وەکوو خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ﴾. واتە: (جا زۆربەی زۆری خەڵکی باوەڕ ناهێنن بە خوای تاك و تەنها، بێ ئەوەی هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن (بێگومان ئیمان و باوەڕی وا هیچ نرخی نییە و خوای گەورە لەو تاوانە خۆش نابێت). [یوسف: ١٠٦].

موشریکەکان دانیان بەوەدا دەنا کە خودا دروستکار و ڕۆزیدەریانە، بەڵام غەیری خواشیان دەپەرست.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ﴾ [الزمر: ٣٨]. واتە: (ئەگەر لە بێباوەران بپرسیت: کێ ئاسمانەکان و زەویی دروست کردووە، بێ دوودڵی و بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەڵێن: خوا). [الزمر: ٣٨].

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ لِمَنِ الْأَرْضُ وَمَنْ فِيهَا إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ * سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ * قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ * سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ * قُلْ مَنْ بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ *سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ فَأَنَّى تُسْحَرُونَ﴾. [المؤمنون: ٨٤-٨٩]. واتە: (تۆش پێیان بڵێ: باشە زەوی و ئەو کەسانەی کە لەسەری دەژین، کێ خاوەنیانە، ئەگەر زیرەك و هۆشیارن؟ ئەگەر شت دەزانن؟ سەرەنجام هەر دان بە ڕاستیدا دەنێن و دەڵێن: هەر خوا، خاوەنیانە، هەر پەروەردگار بەدیهێنەریانە. ئەوسا پێیان بڵێ: جا ئەوە بۆچی یادەوەری وەرناگرن پێیان بڵێ، ئەی کێ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکەیە و کێ پەروەردگاری عەرش و تەختی فەرمانڕەواییی گەورە و فراوانە؟ ئاسمانەکان و زەوی لە بەرانبەر عەرشی پەروەردگاردا، وەکوو ئەڵقەیەکی پەنجە وایە لە پاڵ چیایەکی گەورەدا، سەرەنجام دەڵێن: هەر خوا پەروەردگاریانە، ئەوسا بڵێ: باشە ئاخر ئێوە لێی ناترسن؟ خۆتان ناپارێزن لە خەشم و قینی؟ ئاخر ئێوە لە کێ یاخی دەبن؟ (هەروەها پێیان) بڵێ: کێ جڵەوی هەموو شتێکی بە دەستە، لە کاتێکدا هەر ئەو پەنابەخشە و کەس ناتوانێت لە سزای ئەو زاتە، کەس پەنا بدات، ئەگەر ئێوە بزانن و شارەزا بن. (سەرەنجام بۆ ئەمەش) دەڵێن: هەموو ئەوانە بە دەست خوایە، تۆش بڵێ: کەواتە چۆن جادووتان لێ دەکرێت؟ کە ئەمە دەزانن.

زۆرێك لەوانەی بانگەشەی حەقیقەت دەکەن و قسە لەسەر حەقیقەتە دینییەکان دەکەن، تەنها ئەو حەقیقەتە کەونییە دەبینن کە هەموو شتێک لەژێر دەسەڵاتی خوای پەروەردگاردایە، بەڵام ناپەرستن و فەرمانەکانی جێبەجێ ناکەن. موسڵمان و بێباوەڕ دەزانن کە خوا دروستکاری هەموو شتێکە و ویست و ئیرادەی لەسەر هەر شتێک بێت دێتەدی، بەڵام لە باوەڕبوون بە حەقیقەتە شەرعییەکان جیاوازن

کە ئەوەی خـوا فەرمـانی پێکـردوون جێبەجێـی نـاکەن و ناپەرسـتن. [قەدەرە کەونییەکـان ئەم جۆرە ئیـرادەیە دەگـرێتەوە کە بـۆ بەڕێـوەبردنی هەمـوو بـوون و بوونەوەرانی کەونە، بە هەموو جۆرە جیاوازەکانەوە لە خێر و شەڕ و خواپەرستی و تاوان و چاکەکاری. قەدەرە شەرعییەکان ئیرادەیەکی خواییە بۆ فەرمانە دینییە شەرعییەکان کە خودا لەپێناویـدا پێغەمبەران و کتێبەکانی ناردووە. [مەبەستی ئیبن تەیمیە ئەوەیە موسڵمان و بێباوەڕ باوەڕیـان بە قەدەرە کەونیـەکە هەیە کە خوا بەڕێوەبەر و دروستکاری هەمـوو بوونە، بەڵام باوەڕیـان بە قەدەرە شـەرعییەکە نییە کە بریتییە لە جێبەجێکردنی ئەوەی خوا ناردوویەتی بە پێغەمبەراندا.] وەرگێڕ

کەوا بـوو ئەم حەقیقەتە کەونییە موسڵمان و کـافر تێیدا بەشدارن، ئیماندار و کـافر دەزانـن کـە خـودا دەسـەڵاتدارە بەسـەر هەمـوو شـتێک، کـافریش دان دەنێت بەوەی کە هەموو شتێک موڵکی ئەوە. کەسی باش و خراپیش دان بەوەدا دەنێت و شەیتانیش دان دەنێت بەم حەقیقەتە و ئەهلی ئاگریش دان دەنێن بەم حەقیقەتە.

ئیبلیس ~~دەفەرمووێت~~ دەڵێت: قال إبليسُ: ﴿قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ واتە: (شەیتان وتی: پەروەردگارا دەی کەواتە مۆڵەتم بدە تـا ئـەو ڕۆژەی کـە نـەوەکانی ئادەم زیندوو دەکرێنەوە). [ص: ٧٩].

﴿قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ واتە: (ئیبلیس (بە بوغز و کینە و حەسادەتەوە) وتی: پەروەردگارم، مادەم بـە هـۆی ئـەم مرۆڤـەوە منـت سەرلێشـێواو کـرد، شـەرت بێت لـە زەویـدا هـەموو گوناهـ و لادان و تاوانێکیـان لا جـوان و شـیرین بکـەم و هـەر هـەموویان سەرلێشـێواو و سـەرگەردان بکەم). [الحجر: ٣٩].

﴿قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا﴾ واتە: (پاشان بێ شەرمانە) وتی: پێم بڵێ: ئا ئەمەیە کە ڕێزت داوە بەسـەر منـدا؟! سـوێند بـە خـوا ئەگـەر دوام بخـەیت تـا ڕۆژی قیامـەت ئـەوە

بێگومان هەموو نەوەکانی گومڕا و سەرگەردان دەکەم جگە لە کەمێکیان (کە دەسەڵاتم بەسەریاندا نییە). [الإسراء: ٦٢].

چەندان قسەی تری ئیبلیس لە قورئاندا هەیە کە دان بەوەدا دەنێت کە خودا خاڵقیەتی و خاڵقی جگە لە ئەویشە. ئەهلی ئاگریش دان بەوەدا دەنێن و دەفەرموون: ﴿قَالُوا رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَالِّينَ﴾ واتە: (سەرەنجام بە کەساسییەوە) دەڵێن: پەروەردگارا نەگبەتی و نەهامەتی سەرشانی گرتین و زاڵ بوو بەسەرماندا ئێمە کەسانێکی گومڕا بووین. [المؤمنون: ١٠٦].

خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُوا عَلَىٰ رَبِّهِمْ قَالَ أَلَيْسَ هَٰذَا بِٱلْحَقِّ قَالُوا بَلَىٰ وَرَبِّنَا﴾ واتە: (جا ئەگەر کاتێک ئەوانە دەبینیت (لە بەردەم دادگەی پڕ لە دادیی) پەروەردگاریاندا وەستێنراون، (خوای گەورە پێیان دەفەرموێت: ئایا ئەمەی (کە بۆتان پێشهاتووە و دەیبینن) ڕاست و حەقیقەت نییە؟ (بە کەساسی و خەجاڵەتییەوە) دەڵێن: بەڵێ ڕاستە، سوێند بە پەروەردگارمان).

هەر کەسێک تەنها لەسەر ئەو حەقیقەتە بوەستێت و دەست بگرێت بەوەی کە خودا دروستکار و ڕۆزیدەرە، بەڵام نەیپەرستێت و گوێڕایەڵیی پێغەمبەرەکەی نەکات، ئەوا ئەو کەسە لە جنسی شەیتان و ئەهلی ئاگرە، هەرچەندە ئەو کەسە وا خەیاڵ بکات کە تایبەتە و ئەولیای خودا و ئەهلی زاست و تەحقیقە! بۆیە ئەوانەی ئەمرو نەهی لەسەر خۆیان لا دەدەن و وا دەزانن لەسەریان نەماوە، ئەوا ئەوانە خراپترین ئەهلی کوفر و ئیلحادن.

هەر کەسێک وا بزانێت "خضر" و جگە لە "خضر"یش ئەمرۆ نەهییان لەسەر لا چووە و کردەوە ناکەن، ئەو قسەیە خراپترین قسەیە لە بەرانبەر خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ.

بۆیە ئەو کەسەی تەنها دان بەو حەقیقەتەدا دەنێت کە خوا دروستکارە و ڕۆزیدەرە، ناچێتە بەهەشت، تاوەکوو نەچێتە ناو حەقیقەتی دووەم کە بریتییە لە

جۆری دووەمی "عەبد" [1] بوون، کە بریتییە لە خواپەرستی و گوێڕایەڵیکردنی پەروەردگار و هیچ شتێک ناپەرستێت جگە لە خوای تاک و تەنها. گوێڕایەڵیی پێغەمبەرەکەی دەکات ﷺ و بەندە ئیماندارەکانی خۆش دەوێت و سەریان دەخات، دوژمنانی خوا و پێغەمبەر و ئیمانداران دەکات. ئەم جۆرە عیبادەتە پەیوەستە بە "پەرستراوێتی" [2]، پەروەردگار.

بۆیە ناونیشان و دروشمی تەوحید ئەوەیە: (لا إلَــه إلا اللَّــهُ) پێچەوانەی ئەو کەسانەی کە دان دەنێن بە ڕوبوبیەتی خوا "پەروەردگارێتی" [1]، بەڵام نایپەرستن و گوێڕایەڵیی ناکەن، یان گوێڕایەڵیی خوا دەکەن و دەیپەرستن، بەڵام لەگەڵ پەرستنەکەدا خوایەکی تر دەپەرستن.

پەرستراو: ئەوەیە کە دڵ پێیەوە پەیوەست دەبێت، بەوپەڕی خۆشەویستی و بە گەورەدانان و ڕێزلێگرتن و ترس و ئومێد.. لێی. نموونەی ئەمانەش کە باسکران. جا ئەم جۆرە عیبادەتە ئەم جۆرەیە کە خودا خۆشی دەوێت و لێی ڕازییە.

خوا بەو جۆرە عیبادەتە وەسفی بەندە هەڵبژێردراوەکانی کردووە و بەمەش نێردراوەکانی خۆی ناردووە.

باوەڕدار و بێباوەڕ یەکسانن لەوەدا کە "عەبدن" بەو واتایەی خودا بە بەدیهێنەر و ڕۆزیدەر دەزانن و ڕوبوبیەتیان هەیە، ئەم جۆرە پەرستنە جۆری یەکەمە و کافر و بێباوەڕ تێیدا یەکسانن و مرۆڤ لە کوفرەوە ناگوازێتەوە بۆ ئیمان.

بە جیاکردنەوەی ئەم دوو جۆرە عەبدایەتییە لە یەکتر، دەگەین بە جیاکردنەوەی حەقیقەتە دینییەکان و حەقیقەتە کەونییەکان [حەقیقەتە دینییەکان مەبەست پێی

---

(١) مەبەست لە جۆری یەکەمی "عەبد" ئەوەیە کە هەموو شتێک عەبدی خوایە، چونکە لەژێر دەسەڵات و هێزی پەروەردگاردایە. جۆری دووەمی "عەبد" بەمانایی پەرستن و گوێڕایەڵیکردنی پەروەردگارە.

(٢) ئەم جۆرەیان بریتییە لە بە تاکدانانی خوای بەرز بە هەموو جۆرەکانی پەرستن کە شەرع دایناوە.

(١) "پەروەردگارێتی" بریتییە لە بە تاککردنەوەی خوا بە کردەوەکانی وەکوو دروستکردن و ڕۆزیدان و ژیان و مردن و سوود و زیان..)

ئەمر و نەهیی شەرعییە. مەبەست لە حەقیقەتە کەونییەکان بە تاکڕاگرتنی کردەوەکانی خوایە وەکوو دروستکار و ڕۆزیدەر و ژێنەر و مرێنەر، بەبێ پەرستنی و گوێڕایەڵیکردنی و شوێنکەوتنی پێغەمبەرانی] دەگەیت بەوەی کە خودا لە چی ڕازییە و چیی پێ خۆشە، هەر کەسێک بە فەرمانە شەرعییەکان هەڵستێت و جێبەجێیان بکات خوا خۆشی دەوێن و سەری دەخات و دەیخاتە بەهەشتەکەی، بەڵام بە تەنها دان نان بە حەقیقەتە کەونییەکان کە خودا ڕازقە و دروستکارە بەبێ گوێڕایەڵیکردن، ئەوا کافر و ئیماندار لەوەدا یەکسان و دان دەنێن بەو حەقیقەتە کەونییانەدا.

جا هەر کەسێک تەنها بەوە ڕازی بێت کە خودا دروستکار و ڕۆزیدەرە، بەڵام شوێن حەقیقەتە دینییەکان (شەریعەتی خوا) نەکەوێت، ئەوا لە شوێنکەوتەی ئیبلیسە 'نەفرەتی خوای لێ بێت' و، شوێنکەوتووی کافرەکانە.

هەر کەسێک کەمێک لە حەقیقەتە دینییەکان جێبەجێ بکات و هەندێکی واز لێ بهێنێت، یان لە حاڵەتێکدا هەندێکی بکات و هەندێکی نەکات، ئەوا بە ئەندازەی ئەوە لە بەندایەتییەکەی و چاکییەکەی کەم دەبێتەوە.

جا ئەمە پلە و مەقامێکی زۆر گەورە و گرنگە و زۆر کەس بە هەڵە چووە تێیدا، بە تایبەت لە لایەن ئەو کەسانەی ئەهلی خۆ یەکلاکەرەوەن بۆ خودا (السالکین)، هەتا شێخە گەورەکان تێیدا هەڵخلیسکاون، لە کاتێکدا ئەم شێخانە بانگەشەی تەوحید و عیرفانیان کردووە، ئەمانە زۆرن بەس خوا دەزانێت ژمارەیان چەندە، ئەو خوایەی ئاگای لە نهێنی و ئاشکرا هەیە.

شێخ عبدالقادری گەیلانی ئاماژەی بەو بابەتە کردووە وەکوو لێی دەگێڕنەوە دەفەرمووێت: (زۆربەی خەڵکی کاتێک گەیشتوون بە قەزا و قەدەر وەستاون، تەنها من نەبێت[1]، چونکە من پەنجەرەیەکم بۆ کراوەتەوە لە نوور، بەرەنگاری قەدەری خودا [2] بوومەوە بەو حەقەی کە پێغەمبەران بۆی هاتوون).

---

(١) واتە: زۆربەی خەڵکی بینیویانە خەڵکی تر تاوان و کوفر دەکات وەستاون و ئەمریان بە چاکە ←

پیاو ئەو پیاوەیە بەرەنگاری قەدەر دەبێتەوە (قەدەری کەونی) نەک واز بهێنێت و بڵێت: خوا کوفری دروست کردووە و قەزا و قەدەر و ویستی خوایە بە ئێمە ناگۆڕێت.

ئەوەی کە شێخ عبدالقادری گەیلانی باسی کردووە ئەوەیە کە خوا و پێغەمبەری خوا فەرمانیان پێ کردووە، جا ئەم بابەتە زۆر خەڵک هەڵەیان تێدا کردووە کە خراپە و کوفر بە قەدەر و ویستی خوا دەبینن و پێی ڕازی دەبن ئەگەر کەسێک کەوتە ناو تاوان و کوفر، هیچ ڕێگری ناکەن، چونکە دەڵێن خوا ویستوویەتی. ئەمانە هەڵەن و لە گومڕاییدان چونکە قەدەرە کەونییەکەیان پێش قەدەرە شەرعییەکە خستووە و ئەوە ناکەن کە پێغەمبەران کردوویانە. جا ئەوانەی ئەم مەنهەجەیان هەیە خۆیان چواندووە بە موشریکەکان.

﴿ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكۡنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن شَيۡءٖۚ ﴾ واتا: ئەگەر خوا بیویستایە هاوەڵمان بۆ بڕیار نەدەدا!! باب و باپیرانیشمان موشریک نەدەبوون!! هیچ شتێکیشمان لە خۆمان حەرام نەدەکرد!! (ئەمانە هەمووی قسەی بەتاڵە و هەرگیز خوای گەورە زۆر لە کەس ناکات بۆ باوەڕهێنان یان بێباوەڕی). [سورة الأنعام: ١٤٨].

ئەوان وتیان: ﴿ أَنُطۡعِمُ مَن لَّوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطۡعَمَهُۥٓ ﴾ واتا: ئایا ئێمە خواردن بدەین بە کەسێك ئەگەر خوا بیویستایە خۆراکی پێ دەبەخشی؟. [سورة يس: ٤٧].

---

نەکردووە، چونکە وتوویانە ئەوە قەزا و قەدەری خوایە و بە ئێمە ناگۆڕێت، بۆیە وازیان هێناوە لە ئەمرکردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە.

(٢) واتە: بەرەنگاری قەدەرە کەونییەکە بوومەوە کە خودا هەموو شتێکی دروست کردووە، وەکوو شەڕ و تاوان و کوفر، بەڵام بەو هەقەی کە پێغەمبەران پێی هاتوون من بەرەنگاری ئەو قەدەرە بوومەوە و ئەمرم کرد بە چاکە و ڕێگریم کرد لە خراپە. وەکوو ئەوان نەبووم کە گوتیان: ئەوە تاوانە و قەدەری خوایە بە ئێمە چاک ناکرێت.

وتیـــان: ﴿ وَقَالُواْ لَوۡ شَآءَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مَا عَبَدۡنَٰهُم ﴾ واتـــا: (بـــۆ پینهکردنـــی هەڵوێستی ناڕەوایان) دەیانوت: ئەگەر خوای میهرەبان بیویستایە.. ئێمە ئەمانەمان نەدەپەرست و نەبێت لەسەر بنچینەی هیچ زانستی و زانیارییەك ئەو قسەیە بکەن، ئەمانە تەنها درۆ نەبێت هیچی تر ناڵێن. [سورة الزخرف: ٢٠].

ئەگەر ئەوان هیـــدایەتیان وەربگرتـــایە و بیانزانیـــانە کە ڕازیبـــوون بە قەدەر فەرمـانی پـێ کـراوە، ئەوا پێـی ڕازی دەبـوون و ئارامیـان دەگـرت لەسـەر ئەو ناخۆشییانەی کە تووشیان دەبێت، وەکوو هەژاری و نەخۆشی و ترس..

خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ يَهۡدِ قَلۡبَهُۥ ﴾ واتا: بە فەرمانی خوا نەبێت هیچ خۆشی و ناخۆشییەك پێش نەهاتووە، جا ئەوەی باوەڕی تەواو بهێنێت، خوا دڵی ڕێنموویی دەکات بۆ لای خۆی، (هەر ڕوداوێکی بەسەردا بێت، لە خۆشی و ناخۆشی بە تاقیکردنەوەی دەزانێت) خوای گەورەش هەمیشە بە هەموو شتێک زانایە. [سورة التغابن: ١١].

هەندێک لە پێشینە چاکەکان گوتوویانە: (زۆر جار مرۆڤ ناخۆشییەکی تووش دەبێت دەزانێت لە لایەن خواوەیە، بۆیە ڕازی و تەسلیم دەبێت).

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الأَرْضِ وَلا فِي أَنفُسِكُمْ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ * لِكَيْلا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴾ واتە: (ئەی خەڵکینە! هەر ناخۆشی و بەڵا و موسیبەتێکیان لە زەوی تووش دەبێت و، خۆشتان تووشی هەر نەخۆشی و برسێتی و دەردی خراپ دەبن، ئەوا لە لەوحی مەحفوز نووسراوە، پێش ئەوەی خەڵك دروستکرابن، ئەمەش لەسەر خوای بەرز و مەزن سانا و ئاسانە * ئەمەش بۆ ئەوەیە خەفەت نەخۆن لەسەر ئەوەی کە لە دونیا لە دەستتان چووە و، دڵخۆش نەبن بەوەی پێتان دراوە، دڵخۆشبوونێکی سپڵەییانە و

خۆ بە زلزانانە، خوا هەمو ئەو کەسانەی خۆش ناوێت، کە خۆ بە گەورەزانە بەوەی کە لە دونیا پێی دراوە و شانازیی بەسەر کەسانی دیکەی پێ دەکات). [سورة الحديد: ٢٢ -٢٣].

لە (سەحیحی بوخاری و موسلیم)دا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى عليهما السَّلاَمُ، فقال مُوسَى: أَنْتَ آدَمُ الذي خَلَقَكَ اللَّهُ بيَدِه وَنَفَخَ فِيكَ من رُوحِه، وَأَسْجَدَ لكَ مَلاَئكَتَهُ، وعلمك أسماء كُلِّ شيءٍ، فلماذا أَخْرَجْتَنَا وَنَفْسَك منَ الجنَّة؟ فقال آدم: أنتَ موسى الذي اصطفاك الله برسالاته وبكلامه، فَهَل وَجَدْتَ ذلك مكتوبًا علي قبل أن أُخْلَقَ؟ قال: نعم . قال: فَحَجَّ آدم موسى)[1].
واتا: (ئادەم و موسا بوو بە موناقەشەیان، موسا فەرمووی: (تۆ ئەو ئادەمەی کە خوا بە دەستی خۆی دروستی کردوویت و، لە ڕووحی خۆی تێکردوویت و فەرمانی بە مەلائیکەکان کرد کە سوجدەت بۆ ببەن و ناوی هەموو شتێکی فێرکردیت، ئەی بۆچی تۆ خۆیشت و ئێمەت لە بەهەشت بردە دەرەوە؟ ئادەم فەرمووی: موسا تۆ خوا هەڵیبژاردوویت بە کتێبی خۆی و قسەشی لەگەڵدا کردوویت، ئایا تۆ بینیوتە ئەوەی لەسەر من نووسراوە پێش ئەوەی دروست بکرێم؟ موسا فەرمووی: بەڵێ. پاشان پێغەمبەری خودا دەفەرموێت: (فَحَجَّ آدم موسى). واتا: (ئادەم موسای بێ بەڵگە کرد).

ئادەم بەڵگەی بۆ موسا نەهێناوە بۆ ئەوەی کە پێی بڵێت: مادام لە قەدەردا نووسراوە من تاوانەکەم کرد.

کەسی موسڵمان و ئاقڵ ئەمە ناڵێت، چونکە ئەگەر ئەوە بیانووبووایە بۆ ئادەم، دەبووە بیانوو بۆ شەیتانیش وا، بۆ قەومی نوح و قەومی هود و هەموو کافرەکانی دیکەش.

موساش لۆمەی ئادەمی نەکرد لەسەر ئەو تاوانەی کە تووشی بووە، چونکە ئادەم تەوبەی کرد و گەڕایەوە لای پەروەردگار، خواش هیدایەتی دا و تەوبەکەی

---

(١) رواه البخاري (٣٤٠٩) و مسلم(٢٦٥٢).

لێی قوبووڵ کرد، بەڵام لۆمەکردنەکەی موسا لە ئادەم لەبەر ئەو ناخۆشییانە بوو کە تووشیان هات بە هۆی هاتنە دونیاوە.

لەبەر ئەوە موسا فەرمووی: (فلماذا أَخْرَجْتَا ونَفْسَك مِنَ الجنَّة؟). واتا: (بۆچی نەفسی خۆیشت و ئێمەشت لە بەهەشت دەرکرد؟). ئادەم لە وەڵامدا بە موسای فەرموو: (إنَّ هذا كانَ مكتوبًا عليَّ قَبلَ أنْ أُخْلَقَ). واتا: (ئەوە لەسەر من نووسرابوو پێش ئەوەی دروست بکرێم).

کرداری ئادەم و دەرکردنی ئادەم هەردووکی قەدەری خوا بوو، بۆیە ئەوەی تووشی مرۆڤ دەبێت لە بەڵا و ناخۆشی پێویستە ئارام بگرێت لەسەری، ئەمە ئەوپەڕی ڕازیبوونە بەوەی کە خودا پەروەردگاری تۆ بێت.

عەبد نابێت تاوان بکات و بیانوو بە قەدەر بهێنێتەوە بۆ تاوانەکەی، بەڵام ئەگەر تاوانی کرد، پێویستە بگەڕێتەوە لای پەروەردگار و داوای لێخۆشبوون بکات و تەوبە بکات لەسەر کەموکووڕی و عەیبەکانی و، ئارامیش بگرێت لەسەر ئەو بەڵا و ناخۆشییانەی کە تووشی دێن.

پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ ﴾ واتا: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئارام و خۆڕاگر بە، چونکە بە ڕاستی بەڵێن و وادەکانی خوا هەر دێتەدی، داوای لێخۆشبوونیش بکە بۆ گوناهەکانت. [سورة غافر: ٥٥].

پەروردگاردەفەرموێت: ﴿وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴾ واتا: ئەگەر خۆڕاگر بن و پارێزکار بن و لە خوا بترسن (لە سنوور دەرنەچن)، بە ڕاستی ئەو هەڵوێستە لە کارە پەسەند و کردەوە پایەدارەکانە. [سورة آل عمران: ١٨٦].

دەفەرموێت:

﴿ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾ واتا: بێگومان ئەوەی خۆپارێز بێت لە گوناھ و خۆگر بێت (لە بەرانبەر پێشھاتەکانەوە، خوای گەورە دەرووی لێ دەکاتەوە) ئەوە بە ڕاستی خوا پاداشتی چاکەکاران و چاکەخوازان بە زایە نادات. [سورة يوسف: ٩٠].

## پێویستە فەرمان بە چاکە بکرێت

پێویستە عەبد فەرمان بکات بە چاکە و ڕێگری بکات لە خراپە بەپێی توانا. جیهادی کافر و مونافیقەکانیش بکات لەپێناوی خوا و وا دوژمنایەتیی دوژمنانی خوا بکات و، پێویستە ڕقلێبوون و خۆشەویستیی بۆ ئەوانی تر لەپێناوی خوای پەروەردگار بێت، وەکوو خودا دەفەرمووێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ تُلۡقُونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلۡحَقِّ يُخۡرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمۡ أَن تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمۡ إِن كُنتُمۡ خَرَجۡتُمۡ جِهَٰدٗا فِي سَبِيلِي وَٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِيۚ تُسِرُّونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعۡلَمُ بِمَآ أَخۡفَيۡتُمۡ وَمَآ أَعۡلَنتُمۡۚ وَمَن يَفۡعَلۡهُ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴾

ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بە خوا و پێغەمبەرەکەی هێناوە و کارتان بە شەرع و یاساکەی کردوە! دوژمنی من و دوژمنی خۆتان مەکەن بە دۆست و خۆشەویستیی خۆتان کە سۆزیان بۆ دەنوێنن و، هەواڵەکانی پێغەمبەر ﷺ و نهێنییەکانی موسڵمانانیان پێ دەڵێن، لە کاتێکدا ئەوان بڕوایان نییە بەو حەقەی بۆتان هاتووە، لە ئیمان بە خوا و پێغەمبەرەکەی و ئەو قورئانەی بۆ پێغەمبەرەکەی ناردووەتە خوار، ئەوانە پێغەمبەر و ئێوە — ئەی بڕواداران - لە مەککەوە دەردەکەن، چونکە ئێوە بڕوا بە خوای پەروەردگارتان هێناوە، جا گەر ئێوە - ئەی بڕواداران - لە ڕێی من کۆچتان کردووە و موجاهیدن و، دەتانەوێ لێتان ڕازی بم، دۆستایەتیی دوژمنانی من و دوژمنانتان مەکەن، ئێوە بە نهێنی خۆشەویستییان بۆ دەنوێنن، خۆ من دەزانم بەوەی ئێوە دەیشارنەوە و بەوەش بە ئاشکرا بە دیاری دەخەن، هەر

کەسێک لە ئێوە دۆستایەتییان بکات و خۆشەویستییان بۆ بنوێنێت، ئەوا لە ڕێی حەق و ڕاستی لایداوە و ڕێی ڕاستیی لێ ون بووە.

﴿إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُواْ لَكُمْ أَعْدَآءً وَيَبْسُطُوٓاْ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّواْ لَوْ تَكْفُرُونَ﴾ ئەوانەی ئێوە بە نهێنی خۆشەویستییان بۆ دەردەبڕن، گەر بەسەرتاندا زاڵ بن و سەربکەون، ئەوا دژتان دەوەستنەوە و دەستیان درێژ دەکەن بە کوشتنتان و کۆیلەکردنتان و، هەروا زمانییان درێژ دەکەن بە جنێودانتان، ئەوان - لە هەمو حاڵەتێکدا - ئاواتەخوازن وەك ئەوان بێ‌بڕوا بن.

﴿لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ نە خزمەکانتان و نە منداڵەکانتان لە هیچ شتێک سوودیان بۆتان نابێت، کاتێك ئێوە دۆستایەتیی کافر و بێبڕوایان دەکەن لەپێناو ئەواندا، کەچی ڕۆژی قیامەت خوا لە یەکتریتان جیا دەکاتەوە، جا ئەوانەی بە قسەی خوایان کردووە، دەیانباتە بەهەشتەوە، ئەوانەش سەرپێچییان کردووە، دەیانباتە ئاگری دۆزەخەوە، خوا بینایە بەو کردەوانەی دەیکەن، هیچ شتێک لە قسەکانتان و کردەوەکانتانی لێ شاراوە نییە.

﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُواْ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ﴾ ئەی بڕواداران! ئیبراهیم (سەلامی لێ بێت) و ئەو بڕوادارانەی لەگەڵی بوون، پێشەنگێکی باشن بۆ ئەوەی چاویان لێ بکەن، کاتێ بە قەومە کافر و بێ بڕواکەیان گوت: ئێمە لە ئێوە و لەو پەرستراو و بتانە بەرین، کە لە جیاتیی خوا دەیانپەرستن، ئێمە بڕوامان بە ئێوە نییە و، نکوڵی دەکەین و ناڕازین بەوەی کە لەسەر کوفر و بێ بڕواین، ئەوە دوژمنایەتی و بوغز و قین لەنێوان ئێمە و ئێوە بۆ هەتاهەتایی پەیدا بوو، هەتا ئێوە لەسەر کوفر و بێبڕواییتان بەردەوام بن و، هەتا ئەو کاتەی بڕوا بە خوای تاك و تەنیا دێنن، بەڵام

داواکردنی لێخۆشبوونی ئیبراهیم بۆ باوکی، ئەوە مایەی چاولێکردن نییە و چاوی لێ ناکرێت، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە داوای لێخۆشبوونی بۆ باوکی کردووە، چونکە ئەو داوایە پێش ئەوە بووە کە بۆ ئیبراهیم دەربکەوێت کە باوکی دوژمنی خوایە، جا کاتێک بۆی دەرکەوت کە باوکی دوژمنی خوایە، خۆی لە باوکی بەری کرد، ئەی پەروەردگارمان! پشتمان بە تۆ بەستووە و بە تۆبە و پەشیمانی بۆ لای تۆ گەڕاینەوە، ڕۆژی قیامەتیش گەڕانەوە هەر بۆ لای تۆیە. [سورة الممتحنة: ١ -٤].

دەفەرمووێت:

﴿ لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓاْ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ﴾ واتا: کەسانێکت دەست ناکەوێت باوەڕ بهێنن بە خوا و بە ڕۆژی دوایی، لە کاتێکدا کەسانێکیان خۆش بووێت کە دژایەتیی خوا و پێغەمبەرەکەیان کردبێت، ئەگەرچی ئەو دوژمنانە باب و باپیریان بن یان نەوەیان بن یان برایان بن یان عەشیرەتیان بن، ئەوانەی کە بەو شێوەیەن (ئیمان و باوەڕیان لە هەموو کەسێک لا بە نرختر و پیرۆزترە)، خوا ئیمان و باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووە و جێگیری کردووە و لە بەهرە و میهرەبانیی تایبەتیی خۆی و، بە هێز و گیانێکی تایبەتی لە لایەن خۆیەوە (مەبەست قورئان و ئیمانە) پشتگیریی کردوون و یارمەتیی داون. [سورة المجادلة: ٢٢].

**دەفەرمووێت:** ﴿ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴾ واتا: ئایا ڕەوایە پاداشتی موسڵمانان وەك تاوانبار و تاوانکاران بێت؟! [سورة القلم: ٣٥].

دەفەرمووێت:

﴿ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴾ واتا: نەخێر، ئەو باوەڕەیان هەڵەیە، بەڵکوو ئایا ڕەوایە پاداشتی ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە،

وەک ئەوانە لێ بکەین کە تۆوی خراپەیان چاندووە لە زەویدا، یاخود ئایا ئەوانەی پارێزگار و لە خواترسن وەک خراپەکاران سەیریان بکەین؟! [سورة ص: ٢٨].

دەفەرمووێت:

﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾ واتا: ئایا ئەوانەی کە گوناهـ و تاوانەکانیان ئەنجام داوە، وایانزانیوە هەروەك ئەوانە حسابیان بۆ دەکەین کە ئیمانیان هێناوە و کاروکردەوە و چاکەکانیان ئەنجام داوە؟! ژیانی دونیا و مردن و دوای مردنیان وەك یەك دەبێت؟! ئای کە بڕیاری خراپ بڕیار دەدەن. [سورة الجاثية: ٢١].

دەفەرمووێت:

﴿ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ۝ وَلَا ٱلظُّلُمَـٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ ۝ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ۝ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا ٱلْأَمْوَٰتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَآءُ ۖ وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِى ٱلْقُبُورِ ﴾ واتا: ئاشکرایە کە کوێر و چاوساغ وەك یەك نین. تاریکییەکان و ڕووناکییش چون یەك نین. سێبەر و خۆرەتاویش وەك یەك نین. زیندووان و مردووانیش هاوتای یەك نین. بێگومان خوا ڕاستی دەدات بە گوێی هەر کەسێکدا بیەوێت، بەڵام تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ ناتوانیت پەیامەکەت بگەیەنیت بەو کەسانەی کە لەناو گۆڕدان (مەبەست کافرانە کە وەك مردوو نابیستن و ئەگەر بشبیستن سوودی لێ وەرناگرن). [سورة فاطر: ١٩ -٢٢].

وە دەفەرمووێت:

﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَـٰكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ واتا: خوای گەورە

نموونەی هێناوەتەوە بە پیاوێك کە گیری خواردبێت بە دەست چەند بەرپرسێکی شەڕانی و سەرکەشەوە، پیاوێکی تریش تەنها یەك بەرپرسی هەبێت، ئایا ئەو دوو جۆرە نموونەیە، وەك یەکن، سوپاس و ستایش تەنها شایستەی خوایە، نەخێر یەکسان نییە، بەڵام زۆربەی ئەو خەڵکە لەم ڕاستیە تێ ناگەن و نایزانن و لێکی نادەنەوە. [سورة الزمر: ٢٩].

دەفەرمووێت:

﴿ ۞ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبۡدًا مَّمۡلُوكًا لَّا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَمَن رَّزَقۡنَٰهُ مِنَّا رِزۡقًا حَسَنًا فَهُوَ يُنفِقُ مِنۡهُ سِرًّا وَجَهۡرًاۖ هَلۡ يَسۡتَوُۥنَۚ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ۝ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا رَّجُلَيۡنِ أَحَدُهُمَآ أَبۡكَمُ لَا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوۡلَىٰهُ أَيۡنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأۡتِ بِخَيۡرٍ هَلۡ يَسۡتَوِي هُوَ وَمَن يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾ واتا:

خوا نموونەی هێناوەتەوە بە کەسێکی بەندە کە بێ دەسەڵاتە و هیچ شتێکی نییە، لە بەرانبەر ئەو کەسەدا کە لە ڕزقوڕۆزیی چاك و زۆر، بەهرەوەرمان کردووە، بە ئارەزووی خۆی لێی دەبەخشێت بە نهێنی و ئاشکرا، ئایا ئەو دوو کەسە وەك یەکن؟! سوپاس و ستایش بۆ خوا (کە پەروەردگارێکی کاربەجێیە) بەڵام زۆربەی ئەو خەڵکە نازانن و لەم ڕاستییانە سەریان دەرناچێت (چونکە تەنها دونیا دەبینن).

هەروەها خوا نموونەی هێناوەتەوە بە دوو پیاو کە یەکێکیان لاڵ بێت و هیچی بۆ نەوترێت و هیچی بۆ نەکرێت و بووبێتە بار بەسەر هاوەڵ و کەسوکاریەوە، بۆ هەرچی و بۆ هەر کوێ ڕەوانە بکرێت خێر ناداتەوە، ئایا ئەو کەسە وەکوو ئەو کەسە وایە کە (بەوپەڕی ئازادییەوە)، فەرمان بە داد و دادپەروەری بدات و ڕێبازی ڕاست و دروست دەگرێتە بەر؟! [سورة النحل: ٧٥ -٧٦].

دەفەرموێت:

﴿لَا يَسْتَوِيٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ﴾ واتا: (بێگومان) نیشتەجێکانی دۆزەخ وەك بەهەشتییەکان نین، چونکە هەر بەهەشتییەکان سەرفراز و کامەران و بەختەوەرن. [سورة الحشر: ٢٠].

نموونەی ئەو ئایەتانە کە خودا ئەهلی حەق و باتل لە یەکتر جیا دەکاتەوە، ئەوەی کە لەسەر حەقە، ئەوەی کە لەسەر ناحەقە، ئەوەی ئەهلی گوێڕایەڵییە، ئەوەی ئەهلی خراپەکارییە ئەوەی کە ئەهلی چاکەیە و ئەوەش کە ئەهلی خراپەیە، ئەوەی ئەهلی هیدایەتە و ئەوەی کە ئەهلی گومڕاییە و ئەوەی کە ئەهلی ڕێنماییە، ئەوەی کە ئەهلی لادراوانە و ئەوەی کە ئەهلی ڕاستییە و ئەوەی کە ئەهلی درۆیە.

هەر کەسێک تەنها حەقیقەتە کەونییەکان ببینێت بەبێ حەقیقەتە شەرعییەکان، ئەوا ئەو کەسە یەکسانی دەکات هەموو ئەو جیاوازییانە لە حەق و ناحەق، لە درۆ و ڕاستی لە هیدایەت و گومڕایی لە کوفر و ئیمان، لە کاتێکدا پەروەردگار جیاوازی کردوون بە جیاوازییەکی ئەوپەڕی جیاوازی.

ئەم جیاوازینەکردنە وا لەو کەسە دەکات عیبادەتی خوا و عیبادەتی غەیری خوا بە لایەوە یەکسان بێت وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ بە خوا، لە دونیا لە گومڕاییەکی ڕون و ئاشکرادابووین ﴿إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ (کە ئەمە شاراوە نییە، کەوا ئێوەمان لەگەڵ پەروەردگاری جیهانییان یەکسان کردبوو، وەك ئەومان دانابوون، لە ڕاستیدا هەر ئەویش شایستەی پەرستنە). [سوره الشعراء: ٩٧-٩٨]

هەتا کار گەیشتە ئەوەی خوایان یەکسان کرد بە هەموو عیبادەتەکانیان دەدا بە غەیری خوای پەروەردگار وایاندانا کە خودا هەموو بوونە، ئەمەش گەورەترین بێباوەڕی و کوفرە بە خوای جیهانییان و خوای عەبدەکان.

ئەوان گەیشتن بەوەی کە شایەتییان نەدەدا کە بەندەن، بەو مانایەی کە خوا خۆی دەسەڵاتی نییە بەسەریاندا و عەبدایەتی بۆ خوا ناکەن. ئەوان شایەتی بۆ خۆیان دەدەن کە حەق و ڕاستن. هەروەکوو تاغوتەکانیان بە ڕوونی ئەوەیان خستووەتەڕوو وەکوو (ئیبن عەرەبی) خاوەنی (الفُصُوص) و نموونەی ئەوانەش کە مولحیدبوون و درۆیان کردووە وەکوو (ئیبن سبعین) ئەوان شایەتی دەدەن کە هەم عابد و هەم مەعبودن.

لە ڕاستیدا ئەوە حەقیقەتە کەونی و دینییەکە نییە، بەڵکوو ئەوە سەرلێشێواوی و گومڕاییبیە و، هەروەها کوێربوونە لە بەرانبەر حەقیقەتە کەونییەکان.

لە کاتێکدا ئەوان وای دادەنێن کە بوونی خاڵق بوونی هەموو بوونە بە گشتی. چەندان وەسفی شێواویان داناوە بۆ خاڵق و مەخلۆق لای ئەوان بوونی خاڵق و بوونی مەخلۆق یەک شتە!

بەڵام ئیمانداران ئەوانەی باوەڕیان بە خودا و پێغەمبەری خودا هەیە لە خەڵکی گشتی و خەڵکی تایبەت، ئەوانەی ئەهلی قورئانن وەکوو پێغەمبەری خودا دەفەرمووێت: ﴿إن للّهِ أَهْلين مِنْ النّاسِ﴾. واتا: بێگومان خودا ئەهلی هەیە لەناو خەڵکیدا.

وترا: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: (ئەهلی قورئان ئەهلە تایبەتەکەی خودان).

ئەوانە باش دەزانن خوا خاوەن و پەروەردگاری هەموو شتێکە و، هەر ئەوە دەسەڵاتدار و پاشا و دروستکاری هەموو گەردوونە. دەزانن خوا و مەخلوق لە یەکتر جیاوازن وەکوو ئەوانە نین کە دەڵێن: خوا و مەخلۆق تێکەڵی یەکتربوونە، خوا و مەخلۆق لە یەکتر جیاوازن و یەکسانیش نین و وجوودی پەروەردگار وجودی مەخلوقات نییە.

نەسارا بێباوەڕبوون، چونکە باوەڕیان وابوو کە خوا هاتووەتە ناو مەسیح، ئەمەیان تەنها بۆ مەسیح دانا و تایبەتیان کرد بە مەسیح، ئەی چجای کەسانێک کە ئەمەیان داناوە بۆ هەموو مەخلوقات؟!

ئەهلی قورئـان دەزانـن کە خـوا فەرمـانی کـردووە بە گـوێڕایەڵیی خـۆی و پێغەمـــبەرەکەی و، نەهیـــی کـــردووە لە ســـەرپێچیی فەرمـــانی خـــۆی و پێغەمـبەرەکەی، خـوای پەروەردگـار خـراپەی خـۆش ناوێـت و ڕازی نابێـت کە بەندەکانی کـوفر بکەن، واجبە لەسەر خەڵک کە خوا بپەرستن و گـوێڕایەڵیی فەرمانەکانی بکەن و، داوای یارمەتی و کۆمەکی لە خوا بکەن هەروەکوو لە سورەتی "فاتیحە"دا دەفەرمووێت:

﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ واتـا: خوایـە، تـەنهـا هـەر تـۆ دەپەرستین و هەر لە تۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین (لە کاروباری دین و دونیاماندا، بە کەسی تر لە بەندەکانت ناکرێت). [سورة الفاتحة: ٥].

لە عیبادەت و گـوێڕایەڵیی پەروەردگـار فەرمانکردنە بە چاکە و ڕێگریکردنە لە خراپە بە گـوێرەی توانا و، جیهـادکردنی دووڕوو و بێباوەڕانە لەپێنـاوی خـوای پەروەردگـار، ئەوپەڕی هەوڵ دەدەن بـۆ سەرخستنی دینـی خـوا، بە پشتبەسـتن بە خوا، بە پشتبەستن بە خوا خراپەکان لا دەبەن و چاکەکاری بڵاو دەکەنەوە، هەر شتێک قەدەرکراوە لە خراپە ئەوان لای دەبەن، هەروەکوو چۆن مرۆڤ برسێتیی لا دەبـات بە خـواردن، وەکـوو چـۆن کە کـاتی سـەرما هـات بە جلـوبەرگی گەرم سەرماکەی لا دەبات، بۆیە ئەوەی داخوازی کراوە لای ببە و ئەمر بە چاکە بکە و ڕێگری لە خراپە بکە.

هەروەکوو بە پێغەمـبەری خوا ﷺ گـوترا: (یـا رسـول اللـه! أرأیـتَ أدویـة نتداوی بها، ورقی نَسْتَرَقِي بها، وتُقاةً نتقي بها، هل تردُّ من قَدَرِ اللهِ شـیئًا؟ فقـال: "هِـي مِـنْ قَـدَرِ اللـهِ) [١] واتـا: ئەی پێغەمـبەری خوا ﷺ هەندێک دەرمـان هەن چارەسـەری خۆمـانی پێـدەکەین، وە هەنـدێک ڕوقـیەی شـەرعی هەن ڕوقـیەی پێدەکەین، وە هەندێک پارێزەر هەن خۆمانی پێدەپارێزین، ئایا ئەمـانە قەدەری خوا لادەدەن؟ پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: "ئەمە لە قەدەری پەروەردگارە.

---

(١) رواه الترمذي (٢١٤٨) و ابن ماجه(٣٤٣٧)، و الحاكم (١٩٩/٤) و احمد(٤٢١/٣).

لە فەرمـوودەیەی: (إِنَّ الـدّعاءَ والـبَلاءَ لَيَلْتَقِيــانِ، فَيَعتَلِجــانِ بــينَ السَّــماءِ والأرض)[١] واتـا: (دوعـا و نـارەحەتی و بەڵا بە یەک دەگەن، ململانێـی یەکتـر دەکەن لەنێوان ئاسمان و زەویدا).

ئەمە حاڵی ئەو ئیماندارانەیە کە ئیمانیان بە خوا و بە پێغەمبەری خوا هەیە و بەندایەتی بۆ خوا دەکەن.

ئەوانەی کە تەنها حەقیقەتە کەونییەکە دەبینن کە بریتییە لە "ڕبوبییەتی خوا" خـوا باڵادەسـتە بەسـەر هەمـوو شـتێکدا، جا ئەوان ئەو حەقـیقەتە کەونیـیە دەکەنە ڕێگر و بیانوو کە شوێن فەرمانە دینییەکان بکەون.

ئەوانەی خاوەنی ئەو بیروباوەڕەن لە گومڕاییدا دەبنە چەند پلەیەک:

ئەوانەی زۆر زیادەڕەون ئەو بیروباوەڕە بە گشتی و بە ڕەهایی وەردەگرن، قەدەر دەکەن بە بەڵگە بۆ هەر بێفەرمانییەک کە لە بەرانبەر شەریعەت دەیکەن.

وتەی ئەم کـۆمەڵە لە وتەی یەهـود و نەسـارا زۆر خراپتـرە و، هەمــان وتەی موشریکەکانە کە گوتوویانە:

﴿ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ ﴾ واتــا: (ئەگەر خوا بیویستایە هاوەڵمان بۆ بڕیار نەدەدات!! باب و باپیرانیشمان موشریک نەدەبوون!! هیچ شتێکیشمان لە خۆمان حەرام نـەدەکرد!! (ئەمانـە هەمووی قسـەی بەتاڵە و هەرگیز خوای گەورە زۆر لە کەس ناکات بۆ باوەڕهێنـان یـان بێبـاوەڕی). [سورة الأنعام: ١٤٨].

**گوتیـان:** ﴿ وَقَالُواْ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَٰهُم ﴾ واتـا: (بـۆ پینهکردنـی هەڵوێستی ناڕەوایان) دەیانوت: ئەگەر خوای میهرەبان بیویستایە.. ئێمە ئەمانـەمان

---

(١) سبق تخريجه (ص٣٣)

نەدەپەرست، وەنەبێت لەسەر بنچینەی هیچ زانست و زانیارییەك ئەو قسەیە بکەن، ئەمانە تەنها درۆ نەبێت هیچی تر نالێن. [سورة الزخرف: ٢٠].

ئەمانە گەورەترین دژیەکییان هەیە، بەڵکوو هەموو ئەوانەی کە قەدەر دەکەنە بیانووی بێفەرمانی و ملکەچنەبوونی خوا هەمیشە دژیەکییان هەیە، چونکە ناکرێت هەر کەسێک کارێکی کرد تۆ بێدەنگ بیت بە بیانووی ئەوەی کە قەدەری خوایە، ئەگەر زاڵم زوڵمی کرد یان ویستی خراپە بڵاو بکاتەوە لەسەر زەوی یان دەیەوێت خوێنی خەڵک برێژێت، یان دامێنی خەڵک بۆ خۆی حەڵاڵ دەکات، یان نەوە و منداڵی خەڵکی لەناو دەبات و، لە وێنەی ئەو زوڵمانە، دەکرێت کەس دەستی نەگرێت بە بیانووی ئەوەی کە قەدەر وایە؟!

نەخێر پێویستە بەرەنگاری ئەو قەدەرە ببیتەوە و ئەم قەدەرە لاببەی و بیگۆڕیت بە چاکە و دادگەری و هەروەها پێویستە سزای کەسی ستەمکار بدرێت، تاوەکوو واز بهێنێت لە ستەمکارییەکەی ئەوانەی قەدەر دەکەن بە بیانوو پێیان دەگوترێت: (ئەگەر ئێوە قەدەر دەکەن بە پاساو، ئەوا واز لە هەموو کەسێک بهێنن کەچی دەکات و چی بە ئێوەش دەکات! ئەگەر تۆ وات نەکرد ئەوا ئەسڵی قسەکەت پووچ کردەوە کە دەڵێیت: (قەدەر بەڵگەیە) !!

جا ئەوانەی خاوەنی ئەم وتەیەن "قەدەر و حەقیقەتە کەونییەکان بەڵگەن" خۆیان ئەو قسەیە بە ڕەهایی وەرناگرن و پێیەوە پابەند نابن، بەڵکوو ئەوان شوێن بیر و بۆچوون و هەوا و ئارەزووەکانی خۆیان دەکەون، وەکوو هەندێک لە زانایان ئەوەیان پێ گوتوون:

تۆ کاتێک گوێڕایەڵیی خوا دەکەیت قەدەریت و، کاتێک سەرپێچیی خوا دەکەیت جەبریت، هەر مەزهەبێک هاوڕێک بێتەوە لەگەڵ هەوا و ئارەزووت، ئەوا ئەو مەزهەبەیت!!

کۆمەڵێکی دیکە ئیدیعای تەحقیق و مەعریفە دەکەن، وا گومان دەبەن ئەمر و نەهی تەنها بۆ ئەو کەسانەیە کە باوەڕیان وایە نەفسی خۆیان کردەوە دروست

دەکات و کردەوە بدەنە پاڵ خۆیان و توانای کردنی کاریان بۆ خۆیان جێگیر کردووە.

بەڵام کەسێک وای دەبینێت کە کردەوەکانی دروستکراون و جەبر کراوە لەسەر ئەوەی دەیکات و، خوا کاری بەڕێوە دەبات وەکوو چۆن باقی شتەکانی تر دەجووڵێنێت و ئاراستەیان دەکات، جا ئەوەی ئیمانی وایە کە خوا هەموو شتێک دەکات و هەموو کارەکان دەداتە پاڵ خوا ئەوا لێپرسینەوەی لەسەر نییە، ئەمر و نەهیی لەسەر لا دەچێت.

هەندێکی دیکە دەڵێن: هەر کەسێک باوەڕی بە ئیرادە کەونییەکە هەبێت تەکلیفی شەرعیی لەسەر لا دەچێت و، هەندێک وا گومان دەبەن کە خضر تەکلیفی لاسەر لاچوو، چونکە باوەڕی بەو ئیرادە کەونییە هەبووە.

ئەمانە جیاوازی ناکەن لەنێوان خەڵکی گشتی و تایبەت، ئەوانەی تەنها حەقیقەتە کەونییەکان دەبینن باوەڕیان وایە خوا دروستکاری کرداری بەندەکانە و خوا هەموو شتەکان بەڕێوە دەبات. [ئەو قسەیە دەکەن بە پاساو بۆ تاوانەکانیان چونکە خوا بەڕێوبەری هەموو شتێکە و کرداری عەبدیش خوا خۆی بەڕێوەی دەبات و قەدەرە (وەرگێڕ)].

ئەوان جیاوازی دەکەن لەنێوان کەسێک کە ئەو ڕاستییە وەکوو زانست دەزانێت و، کەسێک بە پلەی موشاهەدە و یەقین گەیشتبێت بەو ڕاستییە، کەسی یەکەم کە تەنها بە زانست ئەو ڕاستییەی درک پێ کردووە ئەوا تەکلیفە شەرعییەکانی لەسەر لا ناچن، بەڵام کەسێک کە دەگاتە پلەی موشاهەدە تەکلیفە شەرعییەکانی لەسەر لا دەچێت، ئەو وا نازانێت کە نەفسی خۆی فعل دەکات، بەڵکوو وا دەزانێت خوا هەمووی هیی خوایە و ئەو هیچ دەسەڵاتێکی نییە بەسەر کردارەکانی بۆیە هیچ کارێک ناکات).

ئەوانەی زیادەڕەوی دەکەن لە توانای ئادەمیزاددا، دەڵێن: "ئادەمیزاد توانای تەواوی هەیە لە بژاردەکان" و ئەوانەش زیادەڕەوی دەکەن لە باوەڕبوون بە قەزا و

قەدەر و نەبوونی توانای ئادەمیزاد بڕیار دەدەن لە کاروکردەوەدا، ئەوانە هیچیان نابنە پاساو و ڕێگر کە ئادەمیزاد تەکلیفە شەرعییەکانی لەسەر لا بچێت.

بە داخەوە هەندێک لەو کەس و گروپانەی ئیدیعای تەحقیق و مەعریفە و تەوحید دەکەن، کەوتوونەتە ناو ئەو هەڵەیە هۆکاری ئەمەش: هەڵەحاڵیبوونە لەوەی کە عەبد فەرمانی بە شتێک پێ کراوە کەچی قەدەری غەیری ئەوەشی لەسەرە [1]، هەروەکوو هەڵەتێگەیشتنی موعتەزیلەکان و جگە لە لەوانیش لە قەدەرییەکان.

پاشان موعتەزیلەکان پابەندبوون بە ئەمر و نەهیی شەرع جێگیر دەکەن، بەڵام بەبێ قەزا و قەدەر کە ویستی خوایە بۆ هەموو دروستکراوەکان و کاروکرداری بەندەکان.

هەندێکی تر قەزا و قەدەر جێگیر دەکەن، بەڵام بەبێ پابەندبوون بە ئەمر و نەهیی شەرع، هەرچەندە ئەوانە نەیانتوانیوە کە بە ڕەهایی نەفیی ئەوە بکەن کە عیبادەتیان لەسەر نییە، جا گوتەی ئەمانە زۆر خراپترە لە گوتەی موعتەزیلەکان، هەر بۆیە لەناویاندا کەسێکی سەلەف بوونی نییە.

ئەوانە هاتوون پابەندبوون و گوێڕایەڵیی شەرع تایبەت دەکەن بەوانەی کە لە حەقیقەتە کەونییەکان ئاگادار نین.

بەڵام ئەوەی حەقیقەتە کەونییەکان دەزانێت، ئەوا پابەندبوونی بە شەرع لەسەر لا دەچێت، ئەوان دەڵێن: (ئەو کەسە تایبەتە) و تەئویلی ئەم بابەتەشیان کردووە کە پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴾ واتا: (بەردەوامیش پەروەردگارت بپەرستە هەتا مردن یەخەت پێ دەگرێت، ئەو کاتە ئیتر بە یەکجاری ڕزگارت

(١) واتا: بە هەڵەتێگەیشتوون لە بێدەسەڵاتیی مرۆڤ لە کاروکردەوە و توانای مرۆڤ لە بژاردەکان.

دەبێت لە هەموو ناخۆشییەکان. [سورة الحجر: ٩٩]. یەقین لای ئەوان، زانینی ئەو هەقیقەتەیە! (١)

وتەی ئەمانە کوفرێکی زۆر ئاشکرا و ڕوونە و هەندێک لە موسڵمانان تێیکەوتوون و ناشزانن کە کوفرە، شتێکی زانراو و ڕوونە لە ئیسلامدا ئەمر و نەهی لەسەر بەندە دەمێنێت هەتاوەکوو مردن، مادام ئەقڵی تەواوە و ئامادەیە. ئەوانەی دەڵێن: (فەرمانەکان لەسەر عەبد تا ئەو کاتەیە کە دەگات بە یەقین و دوای ئەوە ئەمر و نەهیی لەسەر نامێنێت، لە کوفرێکی ئاشکرا و ڕووندان). هەرگیز ئەمر و نەهی لەسەر عەبد لا نابرێت.

بە پاساوی ئەوەی خوا قەدەرەکانی نووسیوە و ئێمە ناچارکراوین، ئەمر و نەهی لا ناچێت و بەردەوام لەسەر مرۆڤ دەمێنێتەوە، ئەگەر کەسێک نەیزانی ئەوە فێر دەکرێت و حاڵی دەکرێت کە حەقیقەتی ئەم بابەتە بەم جۆرە نییە و ئەو بیروباوەڕەی ئێوە لەسەرین کوفرە، بەڵام گەر هەر بەردەوام بوو بەڵگە ڕوونەکان هیچ سوودیان پێنەگەیاند، ئەوا دەکوژرێت!

ئەم جۆرە قسە و بیروڕایە لە دوای سەردەمی سەلەف دەرکەوتن، پێش ئەو سەردەمە ئەو قسانە نەبوون کە مرۆڤ تاوانەکانی خۆی بداتە پاڵ قەدەر و عیبادەت پەیوەست بکەن بە خەڵکە گشتییەکە و بڵێن عیبادەت و ئەمر و نەهی لەسەر کەسە تایبەتەکان نامێنێت! ئەم جۆرە بیروڕایە ڕێگرتنە لە ڕێبازی خوا و دوژمنایەتیکردنی خوا و پێغەمبەری خوایە و، بە درۆخستنەوەی ڕێبازی پێغەمبەرە کە هەموو قسە و کرداری پێچەوانەی ئەو بیروباوەڕە دەسەلمێنێت.

دژایەتیی حوکم و بڕیارەکانی پەروەردگارە، هەرچەندە ئەوانەی ئەم جۆرە قسانە دەکەن هەندێکیان نەزانن و نازانن ئەو قسانە شتی زۆر مەترسیدار لەخۆ دەگرن،

---

(١) واتا: زانینی ئەوەی کە خوا بەڕێوەبەری هەموو بوون و بوونەوەرانی کەونە، بە هەموو جۆر و جیاوازییەکانی ناوی.

سەیرەکە لەوەدایە واش دەزانن ئەوەی ئەوان باوەڕیان پێیەتی و دەیڵێن و بانگەشەی بۆ دەکەن ڕێگەی پێغەمبەران و پیاوچاکانە!

وێنەی ئەو کەسە وەکوو ئەوەیە کەسێک وا گومان دەبات کە نوێژ لەسەری فەرز نییە، عەرەق بۆ ئەو حەڵاڵە و هیچ زیانی نییە، چونکە ئەو گەیشتووە بە پلەی دڵنیایی و حوکم و ئەمر و نەهیی شەرعی هیچی لەسەر نەماوە، گوناح و تاوان و خراپەکاری لای ئەو حەڵاڵە، چونکە وا گومان دەبات بە پلەی یەقینەکەی دەریایە و تاوان و گوناح پیسی ناکات!

گومان لەوەدا نییە کە موشریکەکان پێغەمبەری خوایان بە درۆ دادەنا و هەمیشە لە دوودڵیدابوون (کامە بکەم، کامە نەکەم) لەنێوان ئەوەی شتێک بۆ دین زیاد بکەن و پێچەوانەی شەرعی خوا بێت و لەنێوان ئەوەی قەدەر بکەنە پاساو بۆ تاوانەکانیان.

بۆ لاڕێبوونەکانیان قەدەر بکەن بە بەڵگە. جا ئەوانە هەندێکیان وەکوو موشریکەکان وان، چونکە موشریکەکانیش بە هەمان شێوەی ئەوان (واتە ئەوانەی دەڵێن: گەیشتووین بە یەقین و ئەمر و نەهیمان لەسەر نەماوە) قەدەریان دەکرد بە بەڵگە بۆ خۆیان، تاوانەکانیان دەخستە ملی قەدەر یان شتێکیان دادەهێنا لە دین کە پێچەوانەی شەرعی پەروەردگار بێت.

هەروەکوو خوای پەروەردگار دەربارەی موشریکەکان دەفەرموویت:

﴿ وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً قَالُواْ وَجَدۡنَا عَلَيۡهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَاۗ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ واتا: کاتێکیش (بێباوەڕان) تاوان و گوناهێک ئەنجام بدەن دەڵێن: باب و باپیرانیشمان دیوە ئەم کارەیان کردووە و خوای گەورە خۆی فەرمانی پێداوین بیکەین!! پێیان بڵێ: (نەخێر وا نییە) چونکە بە ڕاستی خوا فەرمان بە گوناه و تاوان و کاری نابەجێ نادات، چۆن (جەسارەت دەکەن) و شتێک هەڵدەبەستن بۆ خوا کە نازانن وتوویەتی یان نا. [سورة الأعراف: ٢٨].

خوای دادگەر دەفەرمووێت:

﴿ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ ﴾

واتا: ئەگەر خوا بیویستایە هاوەڵمان بۆ بڕیار نەدەدا!! باب و باپیرانیشمان موشریک نەدەبوون!! هیچ شتێکیشمان لە خۆمان حەرام نەدەکرد!! (ئەمانە هەمووی قسەی بەتاڵە و هەرگیز خوای گەورە زۆر لە کەس ناکات بۆ باوەڕهێنان یان بێباوەڕی). [سورة الأنعام: ١٤٨].

موشریکەکان داهێنانیان کردووە لە دیندا کە حەرامیان حەڵاڵ دەکرد و داهێنانی جۆرە عیبادەتێک کە خودا بە عیبادەتی دانەناوە و هیچ بەڵگەی لەبارەیەوە نەناردووە.

﴿ وَقَالُواْ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ بِزَعْمِهِمْ وَأَنْعَٰمٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَٰمٌ لَّا يَذْكُرُونَ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا ٱفْتِرَآءً عَلَيْهِ ﴾ واتا: هاوەڵگەران بە بڕیاری نادروستی خۆیان دەیانوت: ئەمانە چەند ماڵات و کێڵگەیەکن قەدەغە کراون، کەس لێیان ناخوات مەگەر ئێمە بمانەوێت و ڕازی بین، هەندێک ماڵاتی تریش حەرام کرابوو پشتیان بۆ سواری و بۆ بار بەکار بهێنرێت، ماڵاتێکی تریش هەن ناوی خوای لەسەر نابەن (ناوی بتەکان دەبەن لە کاتی سەربڕینیاندا) ئەم کارەیان درۆهەڵبەستن بوو بە دەم خواوە (گوایە بەو کارەیان ڕازییە). [سورة الأنعام: ١٣٨]. تا کۆتاییی سوڕەتەکە..

پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَٰرِي سَوْءَٰتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ۝ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا

لِيُرِيَهُمَا سَوْءَاتِهِمَآ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ۝ وَإِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً قَالُوا۟ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ واتا: ئەی نەوەی ئادەم، ئێمە بە ڕاستی پۆشاکی لەبارمان بۆ فەراهەم هێناون، عەورەت و ئەوەی پێتان ناخۆشە دەربکەوێت دایدەپۆشێت، هەروەها جلوبەرگی جوانیش کە خۆتانی پێ بڕازێننەوە (بەڵام بیرتان نەچێت) کە پۆشاکی تەقوا و خواناسی چاکتر و خێردارتر و بە فەڕترە، ئەو پۆشاکە (ماددی و مەعنەوییانە) لە نیشانە و بەڵگەکانی خوای گەورەن بۆ ئەوەی یادەوەری وەربگرن و (یادی بەهەشت بکەن).

ئەی نەوەی ئادەم: شەیتان، ئێوەش لە خشتە نەبات، هەروەک باوک و دایکتانی لە خشتە برد و لە بەهەشتدا بە دەرکردنی دان، لە کاتێکدا دەستی کرد بە داماڵینی پۆشاکەکانیان تا عەورەتیان پیشانی یەکتر بدات، بێگومان شەیتان و داردەستەی ئێوە دەبینن، لە شوێنێکدا کە (دونیایە) ئێوە ئەوان نابینن، جا دڵنیا بن کە ئێمە شەیتانەکانمان کردووە بە یارویاوەری ئەوانەی باوەڕ ناهێنن.

کاتێکیش (بێباوەڕان) تاوان و گوناهێک ئەنجام بدەن دەڵێن: باب و باپیرانیشمان دیوە ئەم کارەیان کردووە و خوای گەورە خۆی فەرمانی پێداوین بیکەین!! پێیان بڵێ: (نەخێر وا نییە) چونکە بە ڕاستی خوا فەرمان بە گوناهـ و تاوان و کاری نابەجێ نادات، چۆن (جەسارەت دەکەن) و شتێک هەڵدەبەستن بۆ خوا کە نازانن وتوویەتی یان نا. [سورة الأعراف: ٢٦ -٢٨].

ئا ئەوانە نەوەی کە دایانهێناوە پێی دەڵێن: حەقیقەت! هەروەکوو چۆن ئەوانەش کە بەڵگەیان هێنایەوە بە قەدەر و قەدەریان کرد بە پاساو و گوتیان: حەقیقەتە! موشریکەکان حەرامیان حەڵاڵ دەکرد و داهێنانیان لە دین دەکرد و دەشیانگوت: حەقیقەتە و خودا ئەمری کردووە.

ئەوانەش کە قەدەر دەکەن بە بەڵـــگە و بیـــانووی تاوانەکانیـــان وەکـــوو موشریکەکانن (لێکی چواندوون).

ڕێگەی حەقیقەت لای ئەوان ئەو ڕێگەیەیە کە هەڵگرانی ئەم ڕێگەیە خۆی نابەستێتەوە بە فەرمانەکانی شەرع، بەڵکوو ئەوەی کە خۆی ئارەزووی دەکات و دڵ دەیەوێت ئەمـانە دەکات بە بەڵگە! لای ئەوان ڕێگەی حەقیقەت ئەوەیە کە حەز و ئـارەزووی بـۆ دەکەن. ئەوانە بە ڕەهـایی قەدەر نـاکەن بە پاساوی تـاوان و کردارەکانیـان، بەڵکـوو کـرۆک و نهێنیـی ئەم بـابەتە ئەوەیە کە ئەوان شـوێن ئارەزووەکانیـان کەوتـوون، بیـانووگرتن بە قەدەر شـتێکە و پـاڵنەری حەز و ئـارەزوو شتێکی ترە.

ئەوەی ئەوان بە ڕەوای دەزانن، هەر ئەوەی خۆیشیان لە حەقیقەت دەزانن، گوێ نـادەن بە شـەرع، بانگەشـەی ئەوەش دەکەن خەڵکـی شـوێنیان بـکەون، وەکـوو داهێنراوەکـانی ئەهلی کەلام وەکوو جەهمی و موعتەزیلەکـان و جگە لەوانـیش داوایان لە خەڵکی دەکرد شوێن ئەقڵیان بکەون لە کاتێکدا قسەکانیان پێچەوانەی قورئان و فەرموودە بوو.

ئەوان ئەقڵـی خۆیـان دەکـرد بە بەڵـگە و پـێچەوانەی قورئـان و فەرموودەیـان دەکـرد. قورئـان و فەرمـوودە لای ئەوان لا دەدرێـت لە مەبەسـتە ڕاسـتەقینەکەی خۆی، بەڵکوو بەو ئاراستەدا بەکاری دەهێنن کە لەگەڵ ئەقڵیان تێک بکاتەوە. یان بە تەواوی پشت لە قورئـان دەکەن، ئەوانە هەرگیز لە قورئـان ڕانـامێنن و لێی تێ ناگەن، بەڵکوو دەڵێن: (ماناکەی خوا دەیزانێت و دەیدەنە پاڵ خودا!!)

لە کاتێکـدا بیروبـاوەڕی خۆیـان پـێچەوانەی ئەم قسـەیەیە. قسـەکانیان شـتێکە بەڵام پێچەوانەی ئەوەیان سەلماندووە!

ئەگەر بە وردی بە دواداچوون بۆ قسەکانیان بکەیت کە پێچەوانەی قورئـان و فەرمـوودەیە، بۆت دەردەکەوێت قسـەکانیان جگە لە نەزانی و بیروبـاوەڕی خراپ هیچی تر نییە!

هەروەها ئەوانەشی کە خۆیان بە خۆشەویستی خوا دەزانن و کاروبارەکانیان پێچەوانەی قورئان و سوننەتە، ئەگەر بە دواداچوون بکەیت بۆ ڕاستیەتیی قسە و بیروباوەڕەکانیان، ئەوا بۆت دەردەکەوێت تەنها هەوا و ئارەزوو و تەنانەت دوژمنانی خواش ئەمە ناکەن کە ئەوان دەیکەن و بانگەشەی بۆ دەکەن بە ناوی خۆشەویستیی خوا و تەزکیەی نەفس و خۆ یەکلاکردنەوە بۆ خودا!!

سەرچاوە و بنەڕەتیی گومڕابوونی ئەمانە بریتییە لە پێشخستنی ئەقڵیان لەسەر قورئان و سوننەت و، پێشخستنی هەوا و ئارەزوویان و پابەندنەبوون بە فەرمانەکانی خودا.

لەزەت و خۆشویستنی شتێک بە گوێرە و ئەندازەی خۆشویستنی بەندەیە بۆ ئەم شتە. ئیمانداران لەزەت و خۆشەویستییان هەیە بۆ خودا و پێغەمبەری خودا، ئیمانداران چێژ دەبەن لە خۆشەویستیی خودا و پێغەمبەری خودا.

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموویت: (ثلاثٌ مَنْ كُنَّ فيه وَجَدَ حلاوةَ الإيمان: مَنْ كانَ اللَّهُ ورَسُولُه أحبَّ إليه ممّا سواهما، ومَن كان يُحِبُّ المَرءَ لا يحبُّه إلا للّه، ومَن كان يَكرَهُ أنْ يَرجعَ في الكفر بعد إذْ أنقذَه اللَّهُ منه كما يَكرَه أنْ يُلقَى في النّارِ). واتە: (سێ شت هەیە هەرکەس تێیدا بێت هەست بە لەزەتی ئیمان دەکات: هەرکەس خوا و پێغەمبەری خوای بە لاوە لە هەموو کەس خۆشەویستتر بێت و، هیچ کەسێکی خۆش ناوێت ئیللا لەبەر خاتری خوا نەبێت و، پێی ناخۆشە بگەڕێتەوە بۆ کوفر و گوناح و تاوان لە کاتێکدا خوا ڕزگاری کردووە، وەکوو چۆن پێی ناخۆشە بخرێتە ناو ئاگر).

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموویت: (ذاقَ طَعْمَ الإيمانِ مَنْ رَضِيَ باللَّهِ ربًّا، وبالإسلامِ دينًا، وبمحمدٍ نَبيًّا). واتە: (تامی ئیمانی چەشتووە ئەو کەسەی ڕازی بووە خودا پەروەردگاری بێت و ئیسلام دینی بێت و □محمد ﷺ پێغەمبەری بێت).

ئەهلی کوفر و بیدعە و شەهەواتیش چێژ دەبەن لەوەی کە دەیپەرستن و خۆشیان دەوێت، ئەگەر ئەو شتە ناحەق و پووچیش بێت.



وترا بە "سوفیانی کوڕی عویەینە" باشە بۆچی ئەهلی هەوا و ئارەزوو ئەو خۆشەویستییە زۆرەیان هەیە بۆ هەوا و ئارەزووی خۆیان؟

سوفیانی کوڕی عویەینە گوتی: ئایا بیرتان چووە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿ وَأُشْرِبُوا فِي قُلُوبِهِمُ الْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ ﴾ واتا: گوێرەکەپەرستی لە دڵ و دەروونیاندا ڕوابوو بە هۆی بێباوەڕییانەوە. [سورة البقرة: ٩٣]. ئەوانەش کە "بت" و "سەنەم"ی خۆیان دەپەرستن خۆشیان دەوێن!

﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ﴾

واتا: (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانەدا) هەندێك کەس هەیە لە جیاتیی ئەوەی خواپەرست بێت، شتانی تر دادەتاشێت بۆ خۆی و (شوێن ڕێنموویییەکانی خوا ناکەوێت و) خۆشەویستی و سۆزی دەدات بەو بت و بەرنامۆلکە و تووڵەڕێگەیانە و خۆشی دەوێن، وەك چۆن ئیمانداران خوایان خۆش دەوێت. [سورة البقرة: ١٦٥].

﴿ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ ﴾ واتا: خۆ ئەگەر بە دەم بانگەوازی تۆوە نەهاتن (واتە نەیانتوانی کتێبی تر بهێنن)، ئەوە چاك بزانە کە ئەوانە هەر شوێنی ئارەزووی خۆیان دەکەون، کێیش هەیە لەوە گومڕاترە کە شوێن ئارەزووەکانی خۆی کەوتبێت، دوور لە هیدایەت و ڕێنموویی خوا. [سورة القصص: ٥٠].

﴿ إِنْ هِيَ إِلَّا أَسْمَاءٌ سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ وَلَقَدْ جَاءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ الْهُدَىٰ ﴾ واتا: ئەم بت و

پەیکەرانە تەنها شتێکە کە خۆتان و باب و باپیرانتان ناوتان لێ ناون و هیچی تر نین، خوا بەڵگەیەکی نەناردووە لەسەر ڕەوابوونیان، سەیرە، ئەوانە تەنها شوێنی گومان و ئارەزووی دەروونە نەخۆشییەکانیان دەکەون، لە کاتێکدا کە بە ڕاستی لە لایەن پەروەردگاریانەوە هیدایەت و ڕێنموییان پێ گەیشتووە! [سورة النجم: ٢٣].

ئەوان مەیل و ئارەزوویان بۆ شیعر و دەنگێک دەچوو کە خۆشەویستی بۆ غەیری خوای لە دڵدا دەوروژاندن، خۆشەویستییەک تایبەت نەبوو بە ئەهلی ئیمان!!

ئەو خۆشەویستییە نەبوو کە خودا دەیەوێت! چونکە خۆشەویستیی ئەهلی ئیمان لە چوارچێوەی قورئان دامەزراوە.

ئەمانەی بانگەشەی ئەو خۆشەویستییە دەکەن کە لە خۆشویستنی ئافرەت و بتیشدا دەست دەکەوێت، بەڵام ئەوان تایبەتی دەکەن بە خودا، لە ڕاستیدا ئەمانە شوێن ئارەزووی خۆیان و نەفسی خۆیان کەوتوون.

دوورن لە قورئان و سوننەت و پێشینەکان. ئەوان شوێن هەست و لەزەتەکانی خۆیان کەوتوون و ناویشی دەنێن خۆشەویستیی ڕاستەقینە و تایبەت، بەبێ گوێدانە قورئان و سوننەت، ئەوانە شوێن ئەوە ناکەون کە خودا پێغەمبەرانی لەپێناو ناردووە.

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۝ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا۟ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ وَإِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۖ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ واتا: لەوەودوا ئێمە تۆمان ئەی محمد ﷺ خستووەتە سەر بەرنامەیەکی ڕاست و ڕەوان لە هەموو کاروبارێکی ئەم ئایینەدا، کەواتە شوێنی بکەوە و لێی لامەدە، نەکەیت شوێنی هەوا و ئارەزووی ئەوان بکەویت کە نازانن و نەفامن. بێگومان ئەوانە هیچ کات فریات ناکەون و لە دەستی خوا ڕزگارت ناکەن (ئەگەر خوا لە خۆت بڕەنجێنیت و نافەرمانیی

بکەیت)، بە ڕاستی ستەمکاران یارویاوەری هەندێکیانن، خوایش پشتوپەنا و خۆشەویستی دیندار و چاکانە. [سورة الجاثية: ١٨ -١٩].

بەڵکوو ئەوانە شوێن هەوا و ئارەزوی خۆیان دەکەون:

﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَـٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾ واتا: (ئایا ئەو بێباوەڕانە ڕازین بە بەرنامەی خوا) یاخود شوێنی ئەو هاوەڵگەڕانە دەکەون کە بە ناوی دینەوە بەرنامەیان بۆ داناون و پەیڕەویان دەکەن بێ ئەوەی خوا مۆڵەتی دابێت و پێی ڕازی بێت (حەرام و حەڵاڵیان بۆ دیاری دەکەن). [سورة الشورى: ٢١].

هەر لەناو ئەواندا کۆمەڵێکی تر پەیدابوون دەستیان دەگرت بە دینەوە، بەڵام تەنها دەستگرتن بە فەرزە دیارەکان و دوورکەوتنەوە لە حەرامکراوە دیار و زەقەکان، بەڵام لەوەدا گومڕابوون کە ئەمری پێکراوە لە دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە، ئەوان ئەو عیبادەتەی ئەمری پێکراوە کە دەست بگرن بە هۆکارەکان پشتیان تێ دەکرد! وا گومانیان برد ئەگەر کەسێک دەست بگرێت بە هۆکارەکان، ئەوا پشتی کردووە لە قەزا و قەدەر! بە ڕاستی ئەوانە لە گومڕاییەکی ئاشکرا و هەڵەیەکی زۆر گەورەدان.

خودا بۆ هەر شتێک هۆکاری داناوە، بەختەوەری و نابەختەوەری پەیوەندە بە هۆکارەکانیانەوە. کەسێک کە بەختەوەرە دەستی گرتووە بە هۆکارەکانی بەختەوەری، کەسێک کە بەدبەختە دەستی گرتووە بە هۆکارەکانی بەدبەختی، وەکوو پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (إنَّ اللَّهَ خَلَقَ للجَنَّة أهْلاً، خَلَقَها لهم و هم في أصلاب آبائهم، و بعملِ أهلِ الجَنَّةِ يعملون، و خَلَقَ للنّارِ أهْلاً، خَلَقَهـا لهـم و هـم في أصـلاب آبـائِهم، و بعمَـل أهـلِ النَّـار يَعْمَلـون). واتە: (خودا کۆمەڵە خەڵکێکی دروست کردووە بۆ بەهەشت، پێشهاتنە دونیا و هەر لە پشتی ئادەم، ئەوانە بە کاروکردەوەی بەهەشتیی لە دونیادا کار دەکەن و خەڵکێکی دروست کردووە بۆ ئاگر، پێشهاتنە دونیا و هەر لە پشتی ئادەم، ئەوانە بە کاروکردەوەی ئەهلی ئاگر لە دونیادا کار دەکەن).

(و كما قال النبيُّ ﷺ لما أَخبرَهم بأَنَّ اللَّهَ كَتَبَ المقاديرَ، فقالوا: يا رسولَ اللَّه! أفلا نَدَعُ العَمَلَ ونَتَّكِلُ على الكتاب؟ فقال: «لا، اعمَلُوا، فكلٌّ مُيَسَّرٌ لما خُلِقَ له، أَمَّا مِن كان من أَهلِ السعادة، فَسَيُيَسَّرُ لعَمَل أهلِ السَّعادة، و أَمَّا مَن كانَ مِنْ أهل الشقاوة فَسَيُيَسَّرُ لعَمَلِ أهلِ الشَّقَاوة» کاتێک پێغەمبەری خودا ﷺ هەواڵی پێدان بە هاوەڵان کە خودا هەموو شتێکی نووسیوە و لە قەدەردا نووسراوە، لێیان پرسی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمە کردەوە بکەین مادام هەموو شتێک نووسراوە؟ پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: نەخێر، کار بکەن، هەر کەسێک بە گوێرەی ئەوە کار دەکات کە بۆی دروست کراوە، ئەوەی بۆ ئاسان دەبێت کە بۆی نووسراوە، کار بکەن، هەر کەسێک ئەهلی بەهەشت بێت کاری ئەهلی بەهەشتی بۆ ئاسان دەبێت، هەر کەسێک ئەهلی بەدبەختی بێت، کاروکرداری ئەهلی بەدبەختیی بۆ ئاسان دەبێت).

[بەو کردارانەی خۆمان دروستی دەکەین، ئاراستە دەبین بۆ کارانێکی دیکە کە بەرەو ئەو قەدەرە نووسراوەمان دەبات کە خودا زانستی پێ هەیە نەک بۆ ئەوەی ئەوە بکەین بە ناچاری تاوەکوو نووسراوەکە بهێتەدی (وەرگێڕ)].

هەر شتێک خودا فەرمانی بە عەبدەکانی کردبێت و عەبدەکانی بە دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە ئەوەی ئەمریان پێکراوە ئەنجامی بدەن، ئەوا خودی دەستگرتنیان بە هۆکارەکانەوە عیبادەتە [واتە: ئەو ئامرازەی دەتگەیەنێت بە ئامانجی عیبادەت، خودی ئامرازەکەش هەر عیبادەتە (وەرگێڕ)].

تەوەکوولیش پەیوەستە بە عیبادەت، وەکوو خوای دادگەر دەفەرمووێت: ﴿ فَٱعۡبُدۡهُ وَتَوَكَّلۡ عَلَيۡهِ ﴾ واتا: دەی کەوابوو ئەو بپەرستە و تەنها پشت بەو ببەستە. [سورة هود: ١٢٣].

دەفەرمووێت:

﴿ قُلۡ هُوَ رَبِّي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ مَتَابِ ﴾ واتا: ئەی پێغەمبەر تۆ بڵێ: ئەو زاتە پەروەردگاری منە و بێجگە لەو خوایەکی تر نییە،

من هەر پشتم بەو زاتە بەستووە، گەڕانەوەشم هەر بۆ لای ئەوە. [سورة الرعد: ٣٠].

**وتەکەی شـــوعەیب کە دەفەرمووێـــت:** ﴿ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴾ واتـــا: پشتوپەنام هەر بەو بەستووە و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێمەوە. [سورة هود: ٨٨].

گروپێکـی تـر هەن سـوننەتەکان تەرک دەکەن و تەنهـا فەرزەکـان دەکەن، بە ئەندازەی تەرککردن قەدریان هەیە ئەوانە.

گروپێکـی دیکەیـان تێدایە بە تەواوی لەخـۆ ونبـوون و لە سـنوور دەرچـوون و بانگەشـەی کەرامـات و غەیـب دەکەن! لە جیاتیی ئەوەی سوپاسی پەروەردگاریـان بـکەن و خـودا بە تـاک و تەنهـا بپەرسـتن، سـەرقاڵی بانگەشـەی کەرامـات و کەشفکردنی نهێنییەکانن، زۆربەی جار ئەمە تووشی ئەوانە دەبێت کە بانگەشەی زوهـد و پـاککردنەوەی دڵ و دەروون دەکەن، بەڵام ئەمە ئەوان ڕزگـار ناکـات، بەڵکـوو ڕزگـاربوونی ئەوان پەیوەسـتە بە دەسـتگرتن بە ئەمرەکـانی خـودا و شوێنکەوتنی پێغەمبەری خودا ﷺ.

وەکـوو "زوهـری" دەفەرمووێـت: (پێشـینەکانی ئـێمە دەیـانگوت: دەسـتگرتن بە سوننەت مایەی ڕزگاربوونە).

هەروەکوو ئیمامی مالیک دەربارەی سوننەت دەفەرمووێت: (سـوننەت وەکـوو کەشـتییەکەی نـوح وایە، هەر کەسێک سـواری بـوو، ڕزگـاری دەبێت، ئەوەشـی سەرنەکەوێت، نقووم دەبێت).

عیبادەت و بەندایەتی و بەردەوامبوون و دەستگرتن بە ڕێگەی ڕاست.. هەمـوو ئەمـانە و هاوشـێوەی ئەمـانە بـۆ یەک مەبەسـتن، ئەم مەبەسـتەش دوو بنچـینەی هەیە:

**یەکەم:** دەبێت تەنها خودا بپەرسترێت.

**دووەم:** خودا بەم شێوەیە بپەرسترێت کە لە شەریعەتەکەی ڕوونکراوەتەوە، خودا ناپەرسترێت بە جگە لە ڕێگەی شەرعەکەی، خودا ناپەرسترێت بە بیدعە و هەوا و ئـــارەزوو و گومـــــان و وام پـــێ چـــاکە. خـــودا دەفەرمووێــــت:

﴿ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًا ﴾

**واتا: بە خۆشنودییەوە با کاروکردەوەی چاک و دروست ئەنجام بدات و بە هیچ شێوەیەک لە پەرستندا هیچ کەسێک نەکاتە هاوەڵ و شەریک بۆی.** [سورة الكهف: ١١٠].

دەفەرمووێت:

﴿ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾واتا: نەخێر وا نییە، هەرکەس بە ڕاستی خۆی بداتە دەست خوا و لە هەمان کاتدا چاکەکار و موسوڵمان بێت، ئەوە پاداشتی خۆی لای پەروەردگاری دەست دەکەوێت و نە ترسیان دەبێت و نە غەم و پەژارە دایان دەگرێت. [سورة البقرة: ١١٢].

دەفەرمووێت:

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴾ واتا: کێ هەیە ئایینی چاکتر و پەسەندتر و جوانتر بێت لەو کەسەی ڕووی کردووەتە خوا و خۆی تەسلیمی ئەو زاتە کردووە و لە کاتێکدا کارجوان و کارپەسەندە و شوێنی ئایینی ئیبراهیمی ملکەچ و فەرمانبەردار کەوتبێت، کە خوا ئیبراهیمی کردووەتە خۆشەویستی خۆی و ڕێزداری کردووە. [سورة النساء: ١٢٥].

**کرداری چاک:** چاکەکارییە، ئەنجامدانی کرداری چاکە، ئەوەیە کە خوا و پێغەمبەری خودا پێیان خۆشە و پێی ڕازین، ئەوەیە فەرمانی پێ کردووە لە واجب و سوننەت.

ئەو عیبادەتانەی کە لە شەرعدا نین و لە قورئان و فەرموودەدا نین، هەر کەسێک بیانکات جا لە هەر پلەوپایەیەکدا بێت هەر زانا و بانگخوازێک بێت

ئەمانە شەرعی نین، پێچەوانەی ئەوەیە کە خودا و پێغەمبەری خودا ﷺ پێیان خۆشە و لێی ڕازین و نابن بە کردەوەی چاک، هەرچەندە ناوبنرێت داهێنراوی چاک.

وتەی خوای پەروەردگار: ﴿ وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴾ واتا: بە هیچ شێوەیەک لە پەرستندا هیچ کەسێک نەکاتە هاوەڵ و شەریک بۆی.

﴿ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ ﴾ واتا: نەخێر وا نییە، هەرکەس بە ڕاستی خۆی بداتە دەست خوا. [سورة البقرة: ١١٢]. ئەمە بریتییە لەوەی کە تەنها خودا بپەرستیت و پابەندی ئەوە بیت کە فەرمانی پێ کردووە، تەنها ڕوو لە خوا بکەیت و داوا لەو بکەیت بە تەنها.

ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب دەیفەرموو: (خوایە! کاروکردەوەکانم هەمووی چاک بکە و وام لێ بکە هەمووی تەنها بۆ تۆ بکەم و مەبەستم هیچ کەسێکی نەبێت، خودایە بەس با بۆ تۆ بن کردەوەکانم و بەش و پشکی هیچ کەسێکی تێدا مەهێڵەوە).

فوزەیلی کوڕی عیاض دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ واتا: تا تاقیتان بکاتەوە، کێتان کردەوەی چاکتر و پەسەندترە. [سورة الملك: ٢].

دەفەرمووێت: (کردەوە دەبێت تەنهاوتەنها بۆ خودا بکرێت و مەبەستت هیچی دیکە نەبێت و، دەبێت بە گوێرەی سوننەت بێت، ئەگەر کردار بۆ خودا بوو، بەڵام بە گوێرەی سوننەت نەبوو، ئەوا ئەم کردارە وەرناگیرێت و، ئەگەر کردەوە بە گوێرەی سوننەت بوو، بەڵام تەنها بۆ خوا نەبوو، ئەوا وەرناگیرێت).

ئەگەر گوترا: ئەگەر خوا هەر شتێک لە کار و گوفتاری خۆش دەوێت و لێی ڕازییە و دەچێتە ناو بازنەی عیبادەت و ئەم کارە یان گوفتارە بە عیبادەت حیساب دەکرێت، ئەی بۆچی عیبادەتی عەتف کردووەتە سەر عیبادەتێکی تر، وەکوو ئەوەی دوو شتی جیاواز بن؟ وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ إِيَّاكَ

نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥ ﴾. واتە: (خوایە، تەنها هەر تۆ دەپەرستین و هەر لە تۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین (لە کاروباری دین و دونیاماندا، بە کەسی تر لە بەندەکانت ناکرێت). [الفاتحه: ٥]. ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ ﴾. عیبادەتە، ئەی بۆ عەتف کراوەتە سەر ﴿ نَسۡتَعِينُ ﴾. ئایا ئەمە دوو شتی جیاوازن ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ و ﴿ نَسۡتَعِينُ ﴾ ؟ ئەگەر جیاواز نین بۆ عەتف کراوەتە سەر شتێکی تر؟ وەکوو ئەوەی خوا بە پێغەمبەرەکەی دەفەرمووێت: ﴿ فَٱعۡبُدۡهُ وَتَوَكَّلۡ عَلَيۡهِۚ ۝١٢٣ ﴾ واتە: (دەی کەوابوو ئەو بپەرستە و تەنها پشت بەو ببەستە). [هود: ١٢٣]. نوح کە دەفەرمووێت: ﴿ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ۝٣ ﴾. واتە: (داواتان لێ دەکەم کە: هەر خوا بپەرستن و لە خەشم و قینی خۆتان بپارێزن و فەرمانبەرداری منیش بن). [نوح: ٣].

ئەمە قسە و دروشمی پێغەمبەرانە.

[مەبەست لەم پرسیارە ئەوەیە: ئەگەر شتێک عەتف بکرێتە سەر شتێک وا دەخوازێت کە شتی یەکەم جیاواز بێت لە شتی دووەم، واتە: دوو شتی جیاواز لە یەکتر، بۆ نموونە: ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥ ﴾. عەتفی ئیستیعانە بە خودا کراوە لەسەر عیبادەتی خوا ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ ﴾ ئایا لێرەدا دوو شتی جیاوازن لە یەکتر؟ (وەرگێڕ)]. لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەگوترێت: ئەم جۆرە عەتفکردنە هاوشێوەی زۆرە لە قورئاندا، وەکوو خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ ﴾ واتە: (چونکە بە ڕاستی نوێژ بەرهەڵستی لە گوناه و تاوان و نادروستی دەکات). [العنكبوت: ٤٥]. لەم ئایەتەدا (فەحشا) بەشێکە لە (مونکەر). هەروەها خوا دەفەرمووێت: ﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ

﴿وَٱلۡبَغۡيِۚ﴾. واتە: (بە ڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادپەروەری و چاکەکاری و یارمەتیدان و بەخشندەیی بە خزمان و قەدەغە لە گوناهـ و تاوان و دەستدرێژی دەکات (بۆ سەر ماڵ و نەفس و نامووس). [النحل: ٩٠].

هەروەها لەم ئایەتەشدا سەردانی خزمان لە دادپەروەری و چاکەکارییە، وەکوو چۆن (فەحشا) بەشێک بوو لە (مونکەر). لە ئایەتێکی تردا خوا دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾. واتە: (ئەوانەش کە بە تەوراتەوە پابەندی دەکەن (کە هانیان دەدات بۆ باوەڕهێنان بە محمد ﷺ و نوێژەکانیان بە چاکی ئەنجام دەدات). [الأعراف: ١٧٠].

هەستان بۆ نوێژ لە گەورەترین دەستگرتنە بە قورئان. خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ﴾ واتە: (چونکە بە ڕاستی ئەوانە چالاک و گورجوگۆڵبوون لە ئەنجامدانی هەموو خێر و چاکەیەکدا و نزای بە کوڵیان دەکرد، بە ئومێدی ڕەحمەت و بەهەشتی ئێمە و لە دۆزەخ و خەشمی ئێمە دەترسان). [الأنبیاء: ٩٠]. کاتێک پێغەمبەران بە ترس و ڕەجا دوعا دەکەن، ئەم کارەیان لە چاکەکاری و باشییە. بۆیە هاوشێوەی ئەم ئایەتانە لە قورئاندا زۆرن کە شتێک عەتف کراوەتە سەر شتێک، بەڵکوو بۆ گرنگی و گەورەیی ئەم شتە. زۆر جار (عەتف) و (مەعتوف) بەشێکن لە یەکتری و پەیوەندییەکە پەیوەندییەکی (خاص) و (عام)ـە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلۡ مَآ أَنفَقۡتُم مِّنۡ خَيۡرٖ فَلِلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَ﴾. ﴿قُلۡ مَآ أَنفَقۡتُم مِّنۡ خَيۡرٖ﴾

واتە: پێیان بڵێ: هەر خێرێک دەکەن. ﴿فَلِلۡوَٰلِدَيۡنِ﴾ واتە: سەرەتا دایک و باوکتان فەرامۆش مەکەن، دایک و باوک و باپیر و داپیر بەرەو سەرەوە دەگرێتەوە. ﴿وَٱلۡأَقۡرَبِينَ﴾ واتە: هەروەها خزمان، عەتف کراوە لەسەر (الوالدين) عەتفی گشتی بەسەر تایبەت، چونکە دایک و باوک لە خزمەکانن، بەڵام بە

تەنیا باس کراوە و پێش هەمووان خراون لەبەر فەزڵ و گەورەیی پلەوپایەیان.. هەندێک جار حاڵەکانی دەگۆڕێت بە گوێرەی ئەوەی کە بە تەنها بێت یان بە شتێکی دیکە ببەسترێتەوە. ئەگەر بە تەنها هات گشتگیر (عام) دەبێت و ئەگەر بەسترایەوە بە جگە لە خۆی، ئەوە تایبەت (خاص) دەبێت، وەکوو ناوی: (الفقیر) و (المسکین)، ئەگەر پێکەوە هاتن ئەم دوو ناوە تایبەتن، ئەگەر بە جیاوازیش هاتن و بە تەنهابوون ئەوا بۆ عامە و گشتگیر دەبێ. وەکوو نموونەی ئەم ئایەتە: ﴿ لِلْفُقَرَاءِ الَّذِينَ أُحْصِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﴾ واتە: (ئەو جۆرە بەخشینانە پێشکەش بکەن) بەو هەژارانەی لەپێناوی خوادا لێبڕاون و ناتوانن بگەڕێن بە زەویدا و بازرگانی و کاسبی بکەن (بە هۆی خەریکبوونیان بە گەیاندنی پەیامی خوا). [البقرە: ٢٧٣].

دەفەرمووێت: ﴿إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ ﴾. واتە: (نان و خۆراکدانە بە دە کەسی هەژار بە شێوەیەکی مامناوەندی کە بۆ خاوخێزانتان سەرفی دەکەن). [المائدە: ٨٩].

لێرەدا (المسکین)، (الفقیر)ـیش دەگرێتەوە، چونکە بە تەنها هاتووە، بەڵام کاتێک بە یەکەوە دێت: ﴿ ۞ إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ ﴾ واتە: (بێگومان زەکات تەنها بۆ هەژار و نەدارانە). [التوبە: ٦٠]. لێرەدا بوون بە دوو جۆری جیاواز، چونکە بە یەکەوە هاتن.

وتراوە: کاتێک (خاص) عەتف دەکرێتە سەر (عام)ـێک ئەوە ناچێتە ناو (عام)ـەکە، کاتێک بە یەکەوە بەسراونەتەوە. بەڵام ئەمە هەمیشە وا نییە، [ئیبن تەیمیە دەڵێت: هەمیشە وا نییە]. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ ﴾. واتە: (ئەو کەسەی دوژمن بێت بە خوا و فریشتەکانی و پێغەمبەرەکانی، بە تایبەت جوبرەئیل و میکائیل). [البقرە: ٩٨].

دەفەرمووێـــت: ﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَـٰقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ﴾ واتە: (بیریـان بخـەرەوە کـە ئێمـە) پـەیمانمان لـە پێغەمبەران وەرگرتووە پەیمانی یەکتاپەرستی، پەیمانی گەیاندنی بانگەوازی خوا، بە تایبەت تۆ ئەی محمد ﷺ و لە نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسای کوڕی مەریەم). [الأحزاب: ٧].

باسکردنی (خاص) و عەتفکردنی بۆ سەر (عام) بۆ کۆمەڵە هۆکارێکی جیاوازن:

هەنـدێک جـار بـۆ ئەوەیە کە ئەو (خاص)ـەی بـاس کـراوە تایبەتمەنـدییەکی هەیە کە بـۆ (عام)ـەکە نیـیە. بـۆ نمـوونە نـوح و ئیبـراهین و موسـا و عیسـا کۆمەڵێک تایبەتمەندییان هەیە کە جیاوازە لە یەکتر. هەندێک جار لەبەر ئەوەیە (عـام) لەفزێکـی گشـتگیر و ڕەهـایە، فەهمـی عمـومی لـێ ناکرێـت، ﴿ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ۝٣ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ ﴾ واتە: (لـە حەرام خۆیـان دەپـارێزن، لـە ڕووی بیروباوەڕ و کردار و گوفتارەوە. ئەوانـەی بـاوەڕ بـە نـەبینراوەکان دەهێـنن (وەك خـوا و فریشـتە و ئەوانـەی خـوا باسـی کـردوون و ئێمـە نایـانبینین)، هـەروەها نوێژەکانیان بە چاکی ئەنجام دەدەن و لەو ڕزقوڕۆزییە (حەڵاڵەی) پێمان بەخشیون، دەبەخشن. (لە هەمان کاتدا) ئەوانە باوەڕ دەهێنن بەو (پەیامەی) کە بۆ تۆ (ئەی محمد ﷺ دابەزێنراوە و بەو پەیامانەش کە بۆ (پێغەمبەرانی "سەلامی خوایان لێ بێت" پێش تۆ دابەزێنراوە). [البقرة: ٢ – ٤].

خوا کە دەفەرمووێت: ﴿ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ ﴾ هەموو غەیبێک کە پێویستە ئیمانت پێی هەبێت لە خۆی دەگرێت، چونکە لەفزێکی گشتگیر و ڕەهایە، بەڵام هێشتا ڕوون نییە، ئەوانەی ئیمانیان بە غەیب هەیە پێویستە ئیمانیان بە هەموو غەیبێک

هەبێت کە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە بێت. دەکرێت مەبەست ئەوە بێت کە ئیمانیان بە هەواڵپێدراوەکە هەبێت کە غەیبە و هەواڵ بە غەیبەکە و ئیمان بەوە هەبێت کە دابەزیوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ ﴾ واتە: (ئەی پێغەمبەر "ص" ئەوەی بۆت ڕەوانە دەکرێت لە قورئان بیخوێنەرەوە و نوێژیش بە چاکی ئەنجام بدە). [العنكبوت: ٤٥].

دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾. واتە: (ئەوانەش کە بە تەوراتەوە پابەندی دەکەن (کە هانیان دەدات بۆ باوەڕهێنان بە محمد ﷺ و نوێژەکانیان بە چاکی ئەنجام دەدا). [الأعراف: ١٧٠].

(وتلاوة الكتاب) واتە: شوێنکەوتن و کارکردن بە قورئان. وەکوو ئیبن مەسعوود دەربارەی وتەی خوای پەروەردگار ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ ﴾. واتە: (دەستەیەك لەوانەی کتێبمان پێ بەخشیون (قورئان) بە چاکی و بە وردی دەوری دەکەنەوە). [البقرة: ١٢١].

دەفەرموێت: (ئەوانەی حەڵاڵە بە حەڵاڵ دەزانن و حەرام بە حەرام دەزانن و، ئەوەی بە لەفزی موتەشابیهە هاتووە ئیمانیان پێ هەیە وم، ئیللا کار بە موحکەمەکان دەکەن).

(فاتباع الكتاب) واتە: نوێژ و جگە لە نوێژ دەگرێتەوە لە عیبادەتەکانی تر، بەڵام کە تایبەت کراوە بە باسکردن لەبەر ئەوەیە تایبەتمەندیی خۆی هەیە بەسەر غەیری خۆیدا. ﴿ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤ ﴾ واتە: (بە ڕاستی هەر من "الله"م، من خوام، هیچ خوایەک نییە جگە لە من، کەواتە هەر من بپەرستە و نوێژەکانیشت بە چاکی ئەنجام بدە، تا هەمیشە منت لە یاد بێت). هەستان بۆ نوێژ لە گەورەترین عیبادەتەکانە. ﴿ ٱتَّقُواْ

ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾﴾. واتە: (لە خوا بترسن و پارێزكار بن، هەمیشە قسە و گوفتاری بەجێ و بەسوود بكەن). [الأحزاب: ٧٠].

﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ﴾ واتە: (لە خوا بترسن و پارێزكار بن، لە ڕێگەی هەموو هۆكار و كردەوەیەكی چاكەوە هەوڵ بدەن ڕەزامەندیی ئەو زاتە بە دەست بهێنن). [المائدە: ٣٥].

﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾﴾ واتە: (لە خوا بترسن و پارێزكار بن، هەوڵ بدەن هەمیشە لەگەڵ ڕاستگۆیان و ڕاستاندا بن). [التوبە: ١١٩].

ئەمانە هەمووی لەوپەڕی تەقوای خوایە ﴿فَٱعۡبُدۡهُ وَتَوَكَّلۡ عَلَيۡهِۚ﴾. واتە: (دەی كەوابوو ئەو بپەرستە و تەنها پشت بەو ببەستە). [هود: ١٢٣].

پشتبەستن و داواكردن لە خوا لە عیبادەتی خوای گەورەیە، خوا بۆیە بە تاك باسی كردووە و تایبەتی كردووە بۆ ئەوەی ئەو كەسەی خوا دەپەرستێت بە تایبەت ئەم عیبادەتانە بكات. چونكە ئەمانە (پشت بە خوابەستن ئیستیعانە) یارمەتیدەرن بۆ مرۆڤ كە هەموو جۆرەكانی عیبادەتی بە لاوە ئاسان بێت. چونكە خوا نەپەرستێت، ئیللا بە هاوكاری و كۆمەكیی خۆی نەبێت. كەواتە ڕوونبووەوە كە تەواویەتیی مەخلوق لەوەدایە كە پەرستنی خوا لە خۆیدا بێنێتەدی، چەند عەبد بەندایەتیی خودا لە خۆیدا بەدی بهێنێت، بەم ئەندازەیە لای خوا بەرز دەبێتەوە وم هەر كەسێك وا گومان ببات كە مەخلوق دەردەچێت لە بەندایەتی بۆ خودا بە هەر جۆرێك لە جۆرەكان، یان وا گومان ببات ئەوە ئەم دەرچوونە لە تەواویەتییە، ئەوا ئەمە لە نەزانترین و گومڕاترینی خەڵكییە. ﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۚ بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسۡبِقُونَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ وَهُم بِأَمۡرِهِۦ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ وَهُم مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ مُشۡفِقُونَ ﴿٢٨﴾﴾.واتە: (خوانەناسان دەیانوت: خوای

میهرەبان کوڕی بۆ خۆی بڕیار داوە (فریشتەکان ڕۆڵەی ئەون)، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەیە، بەڵکوو ئەوانە بەندەی ڕێزداری ئەون. (ئەو فریشتانە ئەوەندە ڕەوشت بەرزن) هەرگیز (نافەرمانیی ناکەن و) قسە لە قسەیدا ناکەن و لە گوفتاردا پێشی ناکەون، ئەوانە بە فەرمانی ئەو دەجوولێنەوە و فەرمانی ئەو جێبەجێ دەکەن. هەر خوا دەزانێت ئەو خەڵکە لە ڕابردوودا چییان ئەنجام داوە و لە داهاتووشدا چی ئەنجام دەدەن (دونیا و قیامەت، ڕابردوو و داهاتوو، بۆ ئەو زاتە چوونیەکە)، فریشتەکانیش تکاکار نابن تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت خوا پێی ڕازییە و ئەو فریشتانە لە ترسی ئەو زاتە ناوێرن هیچ سەرپێچییەک ئەنجام بدەن). [الأنبیاء: ٢٦ – ٢٨].

خوا دەفەرمووێت: ﴿ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗا ﴿٨٨﴾ لَّقَدۡ جِئۡتُمۡ شَيۡـًٔا إِدّٗا
﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِنۡهُ وَتَنشَقُّ ٱلۡأَرۡضُ وَتَخِرُّ ٱلۡجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾
أَن دَعَوۡاْ لِلرَّحۡمَٰنِ وَلَدٗا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنۢبَغِي لِلرَّحۡمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِي
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا ﴿٩٣﴾ لَّقَدۡ أَحۡصَىٰهُمۡ وَعَدَّهُمۡ عَدّٗا ﴿٩٤﴾
وَكُلُّهُمۡ ءَاتِيهِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَرۡدًا ﴿٩٥﴾ ﴾ واتە: (جوولەکە و گاور و بتپەرستان) دەیانوت: خوای میهرەبان ڕۆڵە و نەوەی بۆ خۆی داناوە!! سوێند بە خوا بە ڕاستی بوختانێکی ناقۆڵا دەکەن و گوفتارێکی ناشایستە و سەرسووڕهێنەر دەڵێن. خەریکە ئاسمانەکان لە ناقۆڵاییی ئەو گوفتارە نابەجێیە لەتوپەت ببێت، زەوی خەریکە شەق بەرێت و ڕۆ بچێت، کێوەکانیش خەریکە بکەون و ورد و خاش ببن. کاتێک کە نەفامان بوونی ڕۆڵە و نەوەیان دایە پاڵ خوای میهرەبان. لە کاتێکدا بۆ خوای میهرەبان نەهاتووە و ڕەوا نییە کە نەوە بۆ خۆی بڕیار بدات. هیچ کەسێک نییە لە ئاسمانەکان و زەویدا، کە بەندەی ملکەچی خوای میهرەبان نەبێت. سوێند بە خوا بێگومان هەر هەموویانی سەرژمێر کردووە و یەک یەک ژمارەی کردوون (کەسی لێ ون نابێت)، هەر هەموویان ڕۆژی قیامەت دێنە پێشەوە، بۆ لای بە تاک و تەنها (بێ پاسەوان و بێ کەس). یەکە یەکەی ئەو

خەڵکە بە تاک و تەنهایی دێت و ئامادە دەکرێت لە بەردەم دادگای پڕ لە دادوەریی خوادا). [مريم: ٨٨ – ٩٥].

خوا دەربارەی مەسیح دەفەرمووێت: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَاهُ مَثَلًا لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ ﴿٥٩﴾﴾. واتە: (ئەو عیسایە تەنها بەندەیەکی ئێمە بوو کە نازونیعمەتی پێغەمبەرایەتیمان پێ بەخشی و کردمانە نموونەیەکی چاك بۆ نەوەی ئیسرائیل تا شوێنی بکەون). [الزخرف: ٥٩].

دەفەرمووێت: ﴿وَلَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَمَنْ عِندَهُ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ﴿١٩﴾ يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ ﴿٢٠﴾﴾ واتە: (هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هەر خوا خاوەنیانە و لە خزمەتی ئەودان، بێگومان ئەو فریشتانەی کە لە خزمەتیدان، خۆیان بە گەورە نازانن لە پەرستنیدا و هەرگیز ماندوو و بێتاقەت و بێزار نابن لە ستایشی ئەو زاتە. (بەردەوام) بە شەو و بە ڕۆژ تەسبیحات و ستایشی دەکەن و لە کاتێکدا ساردبوونەوەش ڕوویان تێ ناکات). [الأنبياء: ١٩ – ٢٠].

دەفەرمووێت: ﴿لَّن يَسْتَنكِفَ الْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ وَلَا الْمَلَائِكَةُ الْمُقَرَّبُونَ ۚ وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِ وَيَسْتَكْبِرْ فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا ﴿١٧٢﴾ فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِ ۖ وَأَمَّا الَّذِينَ اسْتَنكَفُوا وَاسْتَكْبَرُوا فَيُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ اللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧٣﴾﴾. واتە: (هەرگیز مەسیح لاریی لەوە نییە کە بەندەی خوا بێت، هەروەها فریشتە نزیکەکانیش، جا ئەوەی لاری و سەرپێچی بکات لە پەرستنی خوا و خۆی بە زل بزانێت، ئەوە (با دڵنیا بێت) هەمووان لە ئاییندەدا لای ئەو زاتە دەبێت کۆ ببنەوە (بۆ لێپرسینەوە). (جا ئەو کاتە) ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کاروکردەوە

چاکەکانیان ئەنجام داوە، ئەوە خوا بە تەواوی و بە چاکی پاداشتەکانیان دەداتەوە و لە فەزڵ و بەخششی تایبەتیی خۆی بۆیان زیادیش دەکات، بەڵام ئەوانەی سەرپێچی و لارییان کردووە و خۆیان بە زل زانیوە، ئەوە خوا سزای زۆر بە ئێشیان دەدات، ئەوسا بێجگە لە خوا کەسێکیان دەست ناکەوێت کە پشتیوانییان لێ بکات و سەریان بخات (ئەڵبەتە ئەو زاتەش بەزەیی پێیاندا نایەتەوە). [النساء: ١٧٢ – ١٧٣].

دەفەرمووێت: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾. واتە: (ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هاناوهاوار بۆ من بهێنن، ئەوە من دوعا و نزاتان گیرا دەکەم، بە ڕاستی ئەوانەی خۆیان بە گەورە دادەنێن و لووتبەرزی دەکەن لە ئاستی پەرستنی مندا، لە ئاییندەدا بە سەرشۆڕی و خەجاڵەتییەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە). [غافر: ٦٠].

دەفەرمووێت: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ۚ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿٣٧﴾ فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ۩ ﴿٣٨﴾ ﴾ واتە: (لە نیشانە و بەڵگەکانی دەسەڵاتی پەروەردگار شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگە، هەرگیز نەکەن سوجدە بۆ خۆر، یان مانگ ببەن، بەڵکوو سوجدە تەنها بۆ ئەو خوایە ببەن کە دروستی کردوون، ئەگەر ئێوە خۆتان بە بەندەی ڕاستەقینەی ئەو دەزانن و هەر ئەو دەپەرستن. جا ئەگەر بێبڕواکان خۆیان بە زل و گەورە بزانن، (ئەوە وازیان لێ بهێنە) چونکە ئەو فریشتانەی لە خزمەت پەروەردگاری تۆدان شەو و ڕۆژ سەرگەرمی تەسبیحات و ستایشن، هەرگیز بێزاری ڕوویان تێ ناکات خۆیان بە گەورە نازانن). [فصلت: ٣٧ – ٣٨].

دەفەرمووێت: ﴿ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ۝٢٠٥ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسۡجُدُونَ ۩ ۝٢٠٦ ﴾. واتە: (یادی پەروەردگارت لە دڵ و دەروونی خۆتدا بە لالانەوە و ترسەوە بکە و، بێ دەنگ بەرزکردنەوە ( لەنێوان چپەو ئاشکرادا)، لە بەیانییان و دەمەو ئێوارانـدا، لە بێئاگایان مەبە (ئەوانەی دڵیان غافڵە). بە ڕاستی ئەوانەی لای پەروەردگارتن خۆیان بە گەورە ناگرن لە پەرستنی ئەو زاتەدا و بەردەوام تەسبیحات و ستایشی دەکەن و سوجدە و کڕنووشی بۆ دەبەن (حەق وایە سەرجەم ئادەمیزادەکانیش چاو لەوان بکەن). [الأعراف: ٢٠٥ – ٢٠٦].

نموونەی چەندان ئایەتی دیکە کە خودا وەسفی بەندەکانی خۆی پێ کردووە و زەمی ئەوانەشی کردووە کە بەندایەتی بۆ خودا ناکەن. ئەم ئایەتانە لە قورئاندا چەندان جار دووبارە بوونەتەوە و هەواڵی داوە کە هەموو پێغەمبەرانی بۆ ئەوە ناردووە. ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ۝٢٥ ﴾ واتە: (ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە کە وەحیمان بۆ نەناردبێت بەوەی کە: بێگومان هیچ خوایەک نییە جگە لە من و دەبێت هەر من بپەرستن). [الأنبیاء: ٢٥].

دەفەرمووێت: ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾. واتە: (سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووە و پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورهپەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر). [النحل: ٣٦].

دەفەرمووێت: ﴿ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ ۝٥٦ ﴾.

واتە: (پەروەردگار بە ئیماندارانی بە گیرهاتوو لەناو کافراندا ڕادەگەیەنێت): ئەی بەندەکانم زەویی من فراوانە، مولْکی من بەربڵاوە (کۆچ بکەن، خۆتان ڕزگار بکەن)، تەنها هەر من بپەرستن). [العنكبوت: ٥٦].

دەفەرمووێت: ﴿ وَإِيَّٰيَ فَٱتَّقُونِ ﴿٤١﴾ ﴾. واتە: (تەنها لە من بترسن و خۆتان لە خەشمی من بپارێزن). [البقرة: ٤١].

دەفەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ﴾. واتە: (ئەی خەڵکینە پەروەردگاری خۆتان بپەرستن، ئەو زاتەی کە ئێوە و پێشینانی ئێوەشی بەدی هێناوە، بۆ ئەوەی ڕێبازی خواناسی و تەقوا و پارێزکاری بگرنەبەر). [البقرة: ٢١].

دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾. واتە: (بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن). [الذاريات: ٥٦].

دەفەرمووێت: ﴿ قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿١١﴾ وَأُمِرۡتُ لِأَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿١٢﴾ قُلۡ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿١٣﴾ قُلِ ٱللَّهَ أَعۡبُدُ مُخۡلِصٗا لَّهُۥ دِينِي ﴿١٤﴾ فَٱعۡبُدُواْ مَا شِئۡتُم مِّن دُونِهِۦۗ ﴾. واتە: (هەروەها ئەی پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" پێیان بڵێ: بە ڕاستی من فەرمانم پێ دراوە هەر خوا بپەرستم و لە هەموو ژیانمدا ملکەچ و فەرمانبەرداری ئایین و بەرنامەی ئەو بم. فەرمانیشم پێ دراوە کە یەکەمین کەس بم لە خواپەرستی و ئیسلامەتی و دینداریدا. هەروەها بڵێ: من زۆر دەترسم لە سزای ڕۆژێکی پڕ مەترسی و سامناك، بە تایبەت ئەگەر سەرکەشی بکەم لە فەرمانی پەروەردگارم. بڵێ: من تەنها هەر خوا دەپەرستم و ملکەچ و فەرمانبەرداری ئایین و بەرنامەکەی ئەو دەبم. جا ئێوەش ئەی بێباوەڕان چی دەپەرستن جگە لەو خوایە). [الزمر: ١١ – ١٥].

هەموو پێغەمبەرێک لە پێغەمبەران بەوە دەستی بە بانگەواز کردووە کە

خەڵکی عیبادەتی خوا بکەن و بە تەنها بەندەی خوا بن. وەکوو نوح و پێغەمبەری دوای ئەویش دەفەرموون: ﴿ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ ﴾ واتە: (جا پێی وتن: ئەی قەوم و گەلم هەر خوا بپەرستن، چونکە هیچ خوایەکی ترتان نییە جگە لەو). [المؤمنون: ٢٣].

لە (المسند)ی ئیمامی ئەحمەددا هاتووە، عن عمر عن النبي أنه قال: (**بُعثت بالسيف بين يدي حتى يعبد الله وحده لا شريك له، وجعل رزقي تحتَ ظل رمحي، وجعل الذلة و الصغارُ على من خالف أمري**). پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت: پێش هاتنی کاتی کۆتاییی دونیا بە شمشێرەوە ڕەوانە کراوم، هەتا تەنیا خوا دەپەرسترێت و هاوبەشی نابێت و، بژێویم خراوەتە سێبەری نێزەمەوە و، زەبوونی و ملکەچی لەسەر هەر کەسێک دانراوە کە دژی فەرمانمە. خودا ڕوونی کردووەتەوە بەندەکانی دەپارێزێت و ڕزگاریان دەبێت لە خراپە. شەیتان دەڵێت: ﴿ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾ واتە: (ئیبلیس "بە بوغز و کینە و حەسادەتەوە" وتی: پەروەردگارم، مادەم بە هۆی ئەم مرۆڤەوە منت سەرلێشێواو کرد، شەرت بێت لە زەویدا هەموو گوناهـ و لادان و تاوانێکیان لا جوان و شیرین بکەم و هەر هەموویان سەرلێشێواو و سەرگەردان بکەم. بێجگە لە بەندە پوختە و دڵسۆزەکانی خۆت نەبێت (چونکە دڵیان بە باوەڕ بە تۆ و یادی تۆ ئاوەدانە، هەوڵ و کۆششی من بۆ وێڵکردنیان ناکامە). [الحجر: ٣٩ – ٤٠].

خوا دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾ واتە: (بە ڕاستی بەندە چاك و پاکەکانی من بە تۆ فریو نادرێن و تۆ هیچ دەسەڵاتێکت نییە بەسەریاندا، جگە لەوانەی کە شوێنت کەوتوون لە سەرکەش و یاخی و سەرگەردانەکان). [الحجر: ٤٢].

دەفەرمووێت: ﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ

ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾. واتە: (ئینجا شەیتان وتی: سوێند بە دەسەڵاتی بێسنوورت شەرت بێت هەر هەموویان گومڕا و سەرگەردان بکەم، جگە لە بەندە و عەبدە دڵسۆزەکانت کە هەڵبژاردەی خۆتن (دەسەڵاتی ئەوانم نییە). [ص: ٨٢ – ٨٣].

خوا لە حەقی یوسفدا دەفەرموویت: ﴿ كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ واتە: (بۆ ئەوەی هەرچی گوناه و تاوان و خراپەیە لێی دوور دەخەینەوە) و بە ڕاستی ئەو لە بەندە هەڵبژاردە و پاکەکانی ئێمەیە). [یوسف: ٢٤].

دەفەرموویت: ﴿ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿١٦٠﴾ ﴾. واتە: (پاکی و بێگەردی بۆ خوای گەورە، دەربارەی ئەو شتانەی کە ئەوان باسی دەکەن و ئەو قسە بێجێیانەی دەیکەن بەرانبەر بە خوا. بەڵام بەندە دڵسۆز و هەڵبژاردەکانی خوا (لەو گوفتار و بۆچوونە خواروخێچانە دوورن). [الصافات: ١٥٩ – ١٦٠].

دەفەرموویت: ﴿ إِنَّهُۥ لَيۡسَ لَهُۥ سُلۡطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلۡطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوۡنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشۡرِكُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾. واتە: (بە ڕاستی تەنها دەسەڵاتی بەسەر ئەوانەدا هەیە کە پشتیان پێ بەستووە و ملکەچ و فەرمانبەرداری ئەو دەبن، هەروەها ئەوانەش کە هاوەڵگەرن بۆ پەروەردگار). [النحل: ٩٩ – ١٠٠].

خودا وەسفی ئەوانە دەکات کە هەڵیبژاردوون لە بەندەکانی خۆی.

﴿ وَٱذۡكُرۡ عِبَٰدَنَآ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ أُوْلِي ٱلۡأَيۡدِي وَٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴿٤٥﴾ إِنَّآ أَخۡلَصۡنَٰهُم بِخَالِصَةٖ ذِكۡرَى ٱلدَّارِ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّهُمۡ عِندَنَا لَمِنَ ٱلۡمُصۡطَفَيۡنَ ٱلۡأَخۡيَارِ ﴿٤٧﴾ ﴾
واتە: (ئەی پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" باس و یادی بەندە بەڕێزەکانمان ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب بکە، هەموویان دەستێکی باڵایان هەبوو لە گەیاندنی ئایینی خوادا، دەستێکی باڵایان هەبوو لە چاکە و چاکەکاریدا،

هەروەها بەرچاوڕوونی و شارەزاییی تەواویان هەبوو لە هەموو ڕووێکەوە. ئێمە بە ڕاستی کردمانن بە بەندەیەکی تایبەتیی خۆمان بە هۆی سیفەتی دونیانەویستی کە ئەویش یادەوەریی ڕۆژی قیامەتە. بە ڕاستی ئەوانە لای ئێمە لەو کەسانەن کە هەڵمانبژاردوون و پەسەندمان کردوون). [ص: ٤٥ – ٤٧].

دەفەرمووێت: ﴿ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلۡأَيۡدِۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ١٧ ﴾ واتە: (بەڵکوو یادی بەندەمان داود بکە کە توانا و دەسەڵاتمان پێ بەخشیبوو، بە ڕاستی ئەو هەمیشە دڵی لای ئێمە بوو، بە تەنگ ڕەزامەندیی ئێمەوە بوو. [ص: ١٧].

دەربارەی پێغەمبەر سولەیمان دەفەرمووێت: ﴿ نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ٣٠ ﴾. واتە: (ئای چ بەندەیەکی چاک بوو، چونکە بێگومان سولەیمان هەمیشە بەسۆزەوە داوای لێخۆشبوونی لە خوا دەکرد). [ص: ٣٠].

دەربارەی پێغەمبەر ئەیوب دەفەرمووێت: ﴿ نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُۖ ﴾. واتە: (ئای چ بەندەیەکی چاک بوو). [ص: ٤٤].

دەفەرمووێت: ﴿ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ ﴾. واتە: (ئەی پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" سەرگوزەشتەی بەندەی ئێمە "ئەیوب"ـیان بۆ باس بکە، کاتێك بانگی لە پەروەردگاری کرد و وتی: بێگومان شەیتان تووشی نەخۆشی و ئازاری کرووم). [ص: ٤١].

دەربارەی نوح دەفەرمووێت: ﴿ ذُرِّيَّةَ مَنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٍۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَبۡدٗا شَكُورٗا ٣ ﴾. واتە: (ئەمانە و خەڵکی تریش) نەوەی ئەو کەسانەن کە (لە کەشتییەکەدا) لەگەڵ نوحدا هەڵمانگرتن (تا سوپاسگوزار بن و قەدری نازونیعمەت و بەخششەکان بزانن)، چونکە بە ڕاستی (نوح) بەندەیەکی زۆر سوپاسگوزار بوو). [الإسراء: ٣].

دەربارەی کۆتا پێغەمبەر دەفەرمووێت: ﴿ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا

﴿مِنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا﴾ واتە: (پاكی و بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەی كە شەوڕەویی كرد لە بەشێكی كەمی شەودا بە بەندەی خۆی (محمد صلی الله علیه وسلم) لە مزگەوتی (حرام، كەعبەی پیرۆزەوە) بۆ مزگەوتی (الاقصی) لە (بیت المقدس) كە دەوروبەریمان پیرۆز و پڕ بەرەكەت كردووە). [الإسراء: ١].

دەفەرمووێت: ﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ١٩﴾. واتە: (جا كاتێكیش بەندەی خوا محمد "صلی الله علیه وسلم" بانگەوازی بۆ شوێنكەوتنی بەرنامەی خوا دەكرد (ئەو خەڵكە بە دەستەی ئادەمیزاد و پەرییەوە) خەریكبوو لەناوی بەرن (نووری خوا بكوژێننەوە). [الجن: ١٩].

دەفەرمووێت: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا﴾. واتە: (جا ئەگەر ئێوە لە دوودڵیدان و گومانتان لەم (قورئانە پیرۆزە) هەیە كە دامانبەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان محمد (صلی الله علیه وسلم). [البقرة: ١٩].

﴿فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ١٠﴾. واتە: (ئینجا خوا لە ڕێگەی ئەوەوە، نیگای كرد بۆ بەندەی خۆی، ئای چ نیگایەك بوو!). [النجم: ١٠].

﴿عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا ٦﴾. واتە: (كە كانییەكە بەندەكانی خوا لێی دەخۆنەوە لە هەر شوێنێكدا بیانەوێت هەڵی دەقووڵێنن و فوارە دەكات). [الإنسان: ٦].

﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا﴾. واتە: (بەندەكانی خوای میهرەبان ئەو كەسانەن كە زۆر بە هێمنی و سەلاری بەسەر زەویدا دەڕۆن، كاتێكیش نەفامان بە قسەوقسەڵۆكی ناخۆش بەرەنگاریان دەبن، لە وەڵامیاندا دەڵێن: سڵاو (ڕەوشتبەرزیی خۆیان دەنوێنن). [الفرقان: ٦٣]. وێنەی ئەمانە زۆر زۆرن لە قورئاندا.

# پلەکانی خەڵکی لە ئیماندا

ئەگەر ئەوەی باس کرا بۆت ڕوون بووەوە، ئەوا بۆت دەردەکەوێت کە خەڵکی لە ئیماندا پلە پلەن و جیاوازن لە حەقیقەتی ئیماندا. خەڵکی دابەش دەبن بۆ خەڵکی گشتی و خەڵکی تایبەت، لەبەر ئەوە لە ڕبووبییەتی خوادا دەبن بە خەڵکی گشتی و خەڵکی تایبەت. بۆیە شیرک لەسەر ئەم ئوممەتەدا بە جۆرێک شاراوەترە لە ترپەی پێی مێروولە لە شەوێکی تاریکی ئەنگوستەچاودا. لە فەرموودەی (صحيح)دا هاتووە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: (**تعس عبد الدينار، تعس عبد الدرهم، تعس عبد الخميصة، تعس عبد الخميلة، إن أعطي رضي، وإن لم يعط سخط**) پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێت: (سەرشۆڕ بێت بەندەی دینار، سەرشۆڕ بێت بەندەی درهەم، سەرشۆڕ بێت بەندەی جلوبەرگ، ئەگەر پێی ببەخشرێت ڕازی دەبێت، ئەگەر پێی نەبەخشرێت تووڕە دەبێت). [(تعس عبد الدينار، تعس عبد الدرهم، تعس عبد الخميصة، تعس عبد الخميلة). واتە: عەبدی دینار ئەو کەسەیە کە بازرگانی بە زێڕەوە دەکات و، عەبدی درهەم ئەوەیە کە بازرگانی بە زیوەوە دەکات و، عەبدی قەمیس ئەو کەسەیە بازرگانی بە قەمیسەوە دەکات، چونکە قەمیس جلێکی ڕەنگاوڕەنگە، هەروەها عەبدی فەرش و هاوشێوەکانی، مەبەستەکە ئەوەیە ئەم کەسە سەرقاڵە بەم شتانەوە و مەرج نییە بازرگانیی پێوە بکات تەنها ئەوەندە بەسە ببێت بە عەبدیان کاتێک یادی خودا و عیبادەتیان بیر دەباتەوە، ئەمانە گەر پێیان ببەخشرێت ڕازی دەبێت و گەر لێیان بگیردرێتەوە تووڕە دەبن، پێغەمبەر ﷺ ناوی ئەو کەسانەی کە سەرقاڵ دەبن بەم جۆرە شتانەوە، ناوە بە عەبد].

پێغەمبەری خوا ناوی ناوە بە بەندەی درهەم و دینار، بە بەندەی (القطیفة) و (الخمیصة)، ئەوەی پێغەمبەری خودا باسی کردووە دوعایە و هەواڵیشە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (تعس وانتكس وإذا شيك فلا انتقش). خەسارەتمەند و زیان لێکەوتوو و ڕەنج بە خەسار بێت.

(النقش) واتە: دەرکردنی دڕکەکە لە پێ. هەروەها (المنقاش) واتە: مووکێش، ئەوەی کە دڕکی پێ دەردەهێنرێت لە قاچ. عەبد و کۆیلەی پارە، ئەوەی دەیەوێت هەرگیز بە دەستی ناهێنێت، نە ئەوەشی هەیە لێی ڕزگاری نابێت کە بەندەی پارەیە، ئەمە حاڵی ئەو کەسانەیە کە سەروەت و پارە و ماڵ دەپەرستن، وەسفکراوە بەوەی ئەگەر پێی درا ڕازی و ئارام دەبێت، ئەگەر لێی گیرایەوە و پێی نەدرا، تووڕە و نائارام دەبێت، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿ وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنْ أُعْطُواْ مِنْهَا رَضُواْ وَإِن لَّمْ يُعْطَوْاْ مِنْهَآ إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ ﴾. واتە: (هەیانە تانەوتەشەر لە تۆ دەدات لە دابەشکردنی زەکات و دەستکەوتدا (پڕوپاگەندە دەکات کە گوایە عەدالەت و دادیی تێدا نییە)، جا ئەوانە ئەگەر بەشیان بدرێت ڕازین، ئەگەر بێبەش بکرێن لێی ئەوە خێرا ئەوان ڕق هەڵدەگرن و کینە لە سینە دەگرن). [التوبە: ٥٨].

ئەوانە ڕازیبوون و تووڕەبوونیان بۆ جگە لە خوایە. ئەمە حاڵی ئەو کەسانەیە کە پەیوەستن بە پلەوپایە و دەسەڵات و دەرکەوتن و خۆنواندن لەبەر چاوی خەڵک، هەمیشە دڵ پەیوەستە بەم شتانەوە. هاوشێوەی ئەم شتانە لە هەوا و ئارەزووی خۆی، ئەگەر بە دەستی هێنا ڕازی دەبێت، ئەگەر بە دەستی نەهێنا تووڕە دەبێت. ئەم جۆرە کەسە دەبێتە بەندەی حەز و ئارەزووەکانی و ئەو شتەی کە دەیەوێت. دەبێتە کۆیلە و بەندەی نەفسی خۆی، بۆیە کۆیلایەتی و بەندایەتیی حەقیقی کۆیلایەتی و بەندایەتیی دڵە، هەر شتێک دڵ بۆی ببێت بە کۆیلە، ئەوە بە حەقیقەت ئەم کەسە دەبێتە کۆیلە و بەندەی ئەم شتە. بۆیە گوتراوە:

العبد حر ما قنع    والحر عبد ما طمع

واتە: (عەبد ئازادە مادام قەناعەتی هەیە، بەڵام کەسی ئازاد مادام قەناعەتی نییە و تەماعی هەیە، کەسێکی عەبد و کۆیلەیە).

دەگوترێت:

أطعت مطامعي فاستعبدتني ولو أني قنعت لكنت حرا

واتە: (بە گوێی هەوا و ئارەزووەکانی خۆم کرد، کردمی بە کۆیلەی خۆی، ئەگەر من قەناعەتم هەبووایە، ئەوا من کەسێکی ئازاد دەبووم).

دەوترێت:

(الطمع غل في عنق قيد في الرجل، فإذا زال الغل من العنق زال القيد من الرجل).

واتە: تەماع کۆت و زنجیرە لە مل و پێیەکان، ئەگەر کۆت و زنجیرەکە لە مل بووەوە، ئەوا کۆتەکە لە پێیەکانیش دەبێتەوە.

عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرمووێت:

(الطمع فقر، واليأس غني، وإن أحدكم إذا يئس من شيء، إستعني عنه).

واتە: تەماع هەژارییە، مەئیوسبوون لە شتێک دەوڵەمەندییە، هەر کەسێك لە شتێک بێئومێد بوو، ئەوا بێپێویست دەبێت لەو شتە. ئەمە شتێکە مرۆڤ لە نەفسی خۆیدا هەستی پێ دەکات، ئەو شتەی مرۆڤ لێی بێئومێد دەبێت داوای ناکات و تەماعی لەسەر نییە و دڵی فەقیر و ئاتاج نییە بۆ ئەو شتە و، بێنیازیشە

لەو کەسانەی ئەوە ئەنجام دەدەن (واتە: ئەوانەی ئەو شتەیان هەیە کە ئەو دڵی پێیەوە پەیوەست نییە).

ئەگەر مرۆڤ تەماعی لە شتێکدا هەبوو، تکای دەکرد کە بە دەستی بهێنێت، ئەوا دڵی پەیوەست و گرێدراو دەبێت بەم شتە. زۆر زەلیل و لاواز دەبێت بۆ بەدەستهێنانی. هەم کزۆڵ و زەلیل دەبێت بۆ بەدەستهێنانی ئەم شتە، هەم کزۆڵ و زەلیل دەبێت لە بەرانبەر ئەو کەسەی کە لای ئەو شتەکە بە دەست دێت، ئەو شتەی دڵ پەیوەستە پێیەوە لای هەر کەسێک بێت بۆی زەلیل و کزۆڵ دەبێت. ئەو خۆ زەلیلکردنە و دڵپەیوەستبوونە لە ماڵ و پلەوپایە و خۆبردنەپێشدا هەیە و، جگە لەوانەش کە مرۆڤ دڵی پەیوەست دەبێت و دەبێتە کۆیلەی ئەم شتە.

پێغەمبەر ئیبراهیم دەفەرمووێت: ﴿فَٱبْتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُواْ لَهُۥٓ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ١٧﴾. واتە: (کەواتە هەر داوای ڕزقوڕۆزی لە خوا بکەن، هەر ئەویش بپەرستن، هەر سوپاسگوزاری ئەو بن، بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە). [العنكبوت: ١٧].

بەندە هەر دەبێت ڕزق بە دەست بهێنێت، چونکە پێویستی پێیەتی، ئەگەر ڕزقەکەی لە خوا داوا کرد، دەبێتە عەبدی خوا و هەژار و ئاتاج بە خوا. ئەگەر داوای ڕزقەکەی لە مەخلوقات کرد، ئەوا دەبێتە عەبد و هەژاریی مەخلوق. هەر لەبەر ئەوەیە داواکردن لە بنچینەدا حەرام کراوە، ئیللا لە کاتی زەروریدا نەبێت ڕێگەی پێ دراوە، دەربارەی نەهیکردن لە داواکردن و سوالکردن فەرموودەی زۆر هاتووە لە (الصحاح) و (السنن) و (المسانيد)، وەکوو پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت: (لَا تَزَالُ الْمَسْأَلَةُ بِأَحَدِكُمْ حَتَّى يَلْقَى اللَّهَ وَلَيْسَ فِي وَجْهِهِ مُزْعَةُ لَحْمٍ)[1] واتە: (کەسانی واتان هەیە ئەوەندە سواڵ دەکات و داوا دەکات، کاتێک بە خزمەت خوای گەورە دەگات دەموچاوی تۆزقاڵێک گۆشتی پێوە نییە).

---

(١) البخاري: ١٤٧٤، والمسلم: ١٠٤٠.

دەفەرمووێت: «مَنْ سَأَلَ وَلَهُ مَا يُغْنِيهِ جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ خُدُوشًا أَوْ كُدُوشًا فِي وَجْهِهِ» [(١)] واتە: «هەر کەسێک سواڵ بکات و بە ئەندازەی نانی ئێوارە و بەیانیی هەبێت، ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا بە دەموچاو ڕوشاوی و شەرمەزارییەوە دێت».

دەفەرمووێت: (لا تحل المسألة إلا لذي غرم مفظع، أو دم موجع، أو فقر مدقع.)[(٢)]

ئەم مانایە لە فەرموودەی ڕاستدا هاتووە: (لأَن يأخذ أحدكم أُحبُلَهُ ثم يأتي الجبل، فيأتي بِحُزْمَة من حطب على ظهره فيبيعها، فَيَكُفَّ الله بها وجهه، خيرٌ له من أن يسأل الناس، أَعْطَوه أو مَنَعُوه) [(٣)] واتە: ئەگەر یەکێکتان گوریسێک ببات و بچێت بۆ شاخێک و کۆمەڵێک دار بهێنێت بەسەر پشتیەوە و بیفرۆشێت و خوای گەورە ڕووی بپارێزێت (لە داواکردن)، ئەمە خێرترە بۆی لەوەی داوا لە خەڵکی بکات، لەوەیە پێی ببەخشن یان پێی نەبەخشن.»

دەفەرمووێت: (ما أتاكَ مِن هذا المالِ وأنتَ غيرُ مستشرِفٍ ولا سائلٍ فخُذْهُ. وما لا فلا تُتبعْهُ نفسَكَ) [(٤)]

واتە: (هەر شتێک لە ماڵ و سەروەت هاتە لای تۆ و تۆش داوت نەکرد و بە دوایدا نەچوویت، ئەوا وەری بگرە، ئەگەر بەم جۆرە نەبوو، ئەوا بە دوویدا مەچۆ و نەفسی خۆت ئازار مەدە بۆی).

---

(١) (أبوداود: ١٦٢٦، والنسائي: (٥/٩٧)، والترمذي: ٩٥٠.

(٢) رواه أحمد: (٣/١٠٠ و ١١٤ و ١٢٦)، و أبوداود: ١٦٤١.

(٣) رواه البخاري: ١٤٧١.

(٤) حديث صحيح، أنظر تخريجه في تعليقي على (الرباعي في الحديث)، (ص: ١٧- ١٨) للحافظ عبدالغني بن سعيد الأزدي.

پێغەمبەری خودا بە کارێکی باشی نەزانیوە مرۆڤ داوا لە خەڵکی بکات و، دڵی لای ماڵ و سامانی خەڵک بێت.

لە فەرموودەی ڕاستدا هاتووە پێغەمبەری خودا دەفەرموویت: (عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه مرفوعاً: أنَّ ناسًا من الأنصارِ سألوا رسولَ الله - صلى الله عليه وسلم - فأعطاهم، ثم سألوه فأعطاهم، حتى نَفِدَ ما عنده، فقال لهم حين أنفقَ كلَّ شيءٍ بيده: «ما يَكُنْ عندي من خير فلن أَدَّخِرَهُ عَنْكُم، ومَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللهُ، ومَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِه اللهُ، ومَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللهُ. وما أُعْطِيَ أَحَدٌ عطاءً خَيراً وأَوسع من الصبرِ) [١]

واتە: لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێت: هەندێک لە ئەنسارەکان داوای (خێریان) لە پێغەمبەر ﷺ کرد ئەویش پێیانی بەخشی، هەتاوەکوو هیچ شتێک نەمایەوە، کاتێک هیچ شتێک نەمایەوە لەبەر دەستیدا، پێیانی فەرموو: «هەر خێرێکم لە لا بێت، لە ئێوەی ناگرمەوە (پێتان دەبەخشم) و هەر کەسێک خۆی بگرێتەوە لە داواکردن لە خەڵکی، خودا قەناعەتی پێ دەبەخشێت، هەر کەسێکیش چاوی لە دەستی خۆی بێت، خودا دەوڵەمەندی دەکات، هەر کەسێکیش هەوڵ بدات ئارام بگرێت، خودا ئارامیی پێ دەبەخشێت و هیچ کەسێک بەخشینێکی پێ نەدراوە خێرتر و فراوانتر بێت وەکوو ئارامگرتن.))

پێغەمبەری خودا وەسیەتی کردووە بۆ هاوەڵە تایبەتەکانی خۆی کە داوای هیچ شتێک لە خەڵکی نەکەن. لە (المسند) هاتووە: (أنَّ أبا بكر كان يسقطُ السوط مِنَ يدهِ فلا يقولُ: لأَحَدٍ ناولني، ويقولُ: إنَ خليلي أَمرَني أنْ لاَ أسألَ النّاسَ شيئاً) واتە: (ئەبو بەکر قامچیی ئەسپەکەی لە دەست دەکەوتە خوارەوە، بە کەسی نەدەگوت پێم بدەنەوە، دەیفەرموو: خۆشەویستەکەم (خليلي) فەرمانی پێ کردووم کە داوای هیچ لە کەس نەکەم).

---

(١) البخاري: ١٤٦٩، والمسلم: ١٠٥٣.

وفي (صحيح مسلم) و غيره، عن عوف بن مالك أنَّ النبيَّ بايعه في طائفةٍ، و أسَرَّ إليهم كلمةً خفيّةً، (أن لا تسألوا النّاسَ شيئاً) (١)

واتە: وە لە (صحيح مسلم) و جگە لەویش هاتووە لە عەوفی کوڕی مالیک کە دەفەرموویّت: (پێغەمبەری خوا بەیعەتی لێ وەرگرتین لەناو کۆمەڵێک خەڵکدا، بە چپە و هێواشی پێی گوتین (داوای هیچ شتێک لە خەڵکی مەکەن).

هەندێک لە هاوەڵان کاتێک قامچیی ئەسپ لە دەستیان دەکەوتە خوارەوە، بە هیچ کەسێکیان نەدەگوت پێمان بدەوە و داوایان لە کەس نەدەکرد. بەڵگەکانی قورئان و فەرموودە لەسەر ئەوەن کە تەنها داوا لە خوا بکرێت و نەهی لەوە دەکەن کە داوا لە هیچ دروستکراوێکی دیکە بکەین، ئەمە لە چەندین شوێندا هاتووە.

﴿ فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ﴿٧﴾ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب ﴿٨﴾ ﴾. واتە: (جا کاتێك لە کارێکی خێر دەبیتەوە، خۆت ماندوو بکە بە کارێکی خێری ترەوە. با هەمیشە و بەردەوام حەز و ئارەزووت بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا بێت، بەردەوام خەڵکیش هان بدە تا پەروەردگارت بناسن و لە هەوڵی ڕەزامەندیی ئەودا بن). [الشرح: ٧- ٨].

فەرموودەی پێغەمبەری خوا کە ئیبن عەباس دەفەرموویّت: (إذا سألت فاسأل الله، وإذا اسْتَعَنْتَ فاسْتَعِن بالله) (٢) واتە: ((ئەگەر داوات کرد، ئەوا تەنها داوا لە خودا بکە و ئەگەر داوای یارمەتی و پشتیوانیت کرد، ئەوا تەنها داوای یارمەتی و پشتیوانی لە خودا بکە.)

پێغەمبەر ئیبراهیم دەفەرموویّت: ﴿ فَٱبْتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ ﴾. واتە: (کەواتە

(١) صحيح مسلم: ١٠٤٣.
(٢) رواه أحمد (٢٩٣/١ و ٣٠٧، والترمذي: ٢٥١٦.

هەر داوای ڕزقوڕۆزی لە خوا بکەن،). [العنكبوت: ١٧].

خوای گەورە نەیفەرمووە: (فابتغوا الرزق عند الله)، چونکە پێشخستنی ظرف بۆ تایبەتکردن و حەمد بەکار دێت، واتە تەنهاوتەنها داوا لە خوا دەکەم.

وەک ئەوەی خوای پەروەردگار بڵێت هیچ ڕزقێک نییە ئیللا لە لایەن خوای پەروەردگارەوەیە، ڕزق تەنهاوتەنها لای پەروەردگارە. وەکوو خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَسۡـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا﴾ واتە: (لە خوای بەخشندە داوا بکەن کە بە فەزڵ و گەورەیی خۆی پێتان ببەخشێت. خوا بە هەموو شتێک ئاگادارە، خوا چاکتر دەزانێت چ چاکە و خێرێك بۆ بەندەکانی شیاوە و دەگونجێت کە بیانداتێ). [النساء ٣٢].

مرۆڤ ئەو شتەی پێویستییەتی دەبێت بە دەستی بهێنێت لە ڕزق و لە غەیری ڕزق، ئەوەشی کە ناخۆشی و بەڵای لەسەر لا دەبات دەبێت بە دەستی بهێنێت. داواکردنی ڕەحمەت و ڕزق لە خودا و داواکردنی یارمەتی لە زیان و ئەو شتانەی لە زیان دووری دەخەنەوە، داواکراوە لە عەبد تەنها داوا لە خودا بکات، داوای هیچ شتێک نەکات لە غەیری خودا، شەکوا و گازندەیی لە حاڵی خۆی نەکات ئیللا لای پەروەردگاری نەبێت، وەکوو پێغەمبەر یەعقوب دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ﴾ [يوسف: ٨٦]. واتە: ( خەم و پەژارەیی و خەمباریم تەنها بۆ خوا دەردەخەم، چونکە هەر ئەو بەڵا و ناخۆشی و نەخۆشی لا دەدات، ئەوەی من لە ڕەحمەت و دەروکردنەوەی خوا دەیزانم، ئێوە نایزانن).

خوای گەورە لە قورئاندا باسی دوورکەوتنەوەیەکی جوانی کردووە لە خەڵکی (الهجر الجميل)، باسی لێبووردنی جوانی کردووە (الصفح الجميل) و باسی ئارامگرتنی جوانی کردووە (الصبر الجميل).

دەربارەی دوورکەوتنەوەی جوان (الهجر الجميل) وتراوە: وازهێنانە لە خەڵکی بەبێ ئازاردانیان.

دەربارەی لێبووردنی جوان (الصفح الجميل) وتراوە: لێبووردنە لە خەڵکی بەبێ ئەوەی لۆمەیان بکەیت.

دەربارەی ئارامگرتنی جوان (الصبر الجميل) وتراوە: ئارامگرتنە بەبێ ئەوەی گلەیی و بۆڵەبۆڵ و گازندە ببەیتە لای مەخلوق.

ئیمامی "ئەحمەد" هیچ گلەیی و گازندە و شەکوایەکی نەکرد هەتاوەکوو مرد، پێی ناخۆش بوو "ئۆف"ێکیش بکات! (١)

بەڵام شەکواکردن و باسکردنی حاڵ و گوزەرانی ناخۆشیی خۆت بۆ لای خودا، ئارامگریی جوان هەڵناوەشێنێتەوە و دژ نییە لەگەڵ ئارامگرتنی جوان (الصبر الجميل). کەواتە شەکوابردن بۆ لای خودا پێچەوانەی ئارامگرتنی جوان (الصبر الجميل) نییە.

پێغەمبەر یەعقوب فەرمووی: ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾ و، فەرمووی: ﴿إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ﴾ [يوسف: ٨٦]. واتە: (خەم و پەژارەیی و خەمباریم تەنها بۆ خوا دەردەخەم، چونکە هەر ئەو بەڵا و ناخۆشی و نەخۆشی لا دەدات، ئەوەی من لە ڕەحمەت و دەروکردنەوەی خوا دەیزانم، ئێوە نایزانن).

عومەری کوڕی خەتتاب لە نوێژی بەیانیدا سوڕەتی یوسفی دەخوێند تاوەکوو گەیشتە ئەم ئایەتە ﴿إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ﴾ دەستی کرد بە گریان و هێندە کاریگەریی لەسەر دڵی عومەر دانا، تاوەکوو نرکەنرکی گریانی گەیشتە ڕیزەکانی کۆتاییی نوێژخوێنان.

لە دوعاکانی پێغەمبەر موسا دەیفەرموو: (اللهم لك الحمد، وإليك المشتكى، وأنت المستعان، وبك المستغاث، وعليك التكلان، ولا حول ولا قوة إلا بك). واتە: (ئەی خوایە، ئەوپەڕی سوپاس و ستایش بۆ تۆ و گازندە و شەکوا هەر بۆ لای

---

(١) سير أعلام النبلاء ١١/٢١٥

تۆیە، تۆی پشتیوان و یارمەتیدەری ئێمە، تۆی فریادڕەس و داوای یارمەتی هەر لە تۆ دەکەین و، پشت هەر بە تۆ دەبەستین و، هیچ هێز و توانایەک نییە ئیللا تۆ نەبێت).

دوعای پێغەمبەری خوا کاتێک گەڕایەوە لە (طائیف) فەرمووی: (اللّهُمّ إِلَيْك أَشْكُو ضَعْفَ قُوّتِي، وَقِلّةَ حِيلَتِي، وَهَوَانِي عَلَى النّاسِ، يَا أَرْحَمَ الرّاحِمِينَ! أَنْتَ رَبّ الْمُسْتَضْعَفِينَ وَأَنْتَ رَبّي، إلَى مَنْ تَكِلُنِي؟ إلَى بَعِيدٍ يَتَجَهّمُنِي ؟ أَمْ إلَى عَدُوّ مَلّكْتَهُ أَمْرِي؟ إنْ لَمْ يَكُنْ بِك عَلَيّ غَضَبٌ فَلَا أُبَالِي، وَلَكِنّ عَافِيَتَك هِيَ أَوْسَعُ لِي، أَعُوذُ بِنُورِ وَجْهِك الّذِي أَشْرَقَتْ لَهُ الظّلُمَاتُ وَصَلُحَ عَلَيْهِ أَمْرُ الدّنْيَا وَالْآخِرَةِ مِنْ أَنْ تُنْزِلَ بِي غَضَبَك، أَوْ يَحِلّ عَلَيّ سُخْطُكَ، لَك الْعُتْبَى حَتّى تَرْضَى، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوّةَ إلّا بِك) (١)

واتە: (خودایە! من زەعیفی و بێدەرەتانی و بێفێڵی و بێنرخیم لای خەڵک بۆ تۆ دەدرکێنم، ئەی ئەو کەسەی لە هەموو کەس بە بەزەییتریت، ئەتۆ خودای بێهێزانی، ئەتۆ خودای منی و تاك و تەنها و بێ هاوەڵیت، بە کێم دەسپێریت! بە بێگانەیەک کە بە ڕووی گرژ و مۆنەوە سەیرم دەکات؟ یان دەمسپێریت بە دوژمنێك و کاروبارم دەخەیە ژێردەستییەوە! سەرباری هەموو ئەمانەش ئەگەر تۆ لێم ڕازی بیت هەموو شتێک دەخەمە لاوە، تۆم لێ نەڕەنجێیت باکم نییە، ئەوەندە هەیە خۆشنوودیی تۆ بۆ من لە هەموو شتێک فراوانترە، پەنا دەگرم بە ڕووناکیی ڕووت کە هەموو تاریکییەك لا دەبات، بەختەوەریی دونیا و قیامەت لەسەر ڕەزامەندیی تۆ بەندە و پەیوەستە بە ڕووناکیی ڕووت. پەنا دەگرم لەوەی کە قار و قینی خۆتم بەسەردا بڕێژیت، یان لێم زویر ببیت و ناڕازی بیت لێم. هەموو کەس شایانی سەرزەنشتکردنە تا تۆی لێ ڕازی دەبیت، هیچ پەنا و هێزێک نییە جگ لە پەنا و پشتگیریی تۆ!!

---

(١) إبن هشام: (١/٤٢٠).

لە هەندێک لە ڕیوایەتەکان دەفەرموویێت: (ولا حَوْلَ ولا قوَّةَ إلا بك) [١]

کاتێک تەماع و ویستی بەندە زۆر دەبێت بۆ ڕەحمەت و فەزڵ و بەخشش و ئاتاجی خوا و پاراستنی لە زیان و زەرەر، ئەوا بەندایەتیی عەبد زیاد دەبێت بۆ خودا.

بە ئەندازەی ئاتاجبوون بۆ خودا بەندایەتیی عەبد بۆ خودا زیاد دەبێت و ئازاد دەبێت لە غەیری خودا تەنها خودا دەپەرستێت، وەکوو چۆن ئەگەر کەسێک پێویستیی کەسێک بوو، بە دروستکراوێک بوو وا دەخوازێت ملکەچیی بۆ بکات، چەندە پێویستیی بە عەبدێکی دیکە بوو دەبێتە کۆیلەی ئەم مەخلوقە و، چەندەش دڵی بێ پێویست بێت لێی، ئەوا نائومێد دەبێت لەو مەخلوقە. وەکوو وتراوە: (بێ پێویست بە لەو کەسەی کە دەتەوێت، ئەوا دەبیتە هاوشێوەی ئەو، فەزڵ و چاکەت هەبێت بۆ هەر کەسێک، ئەوا دەبیتە گەورەی ئەو. داوا لە هەر کەسێک بکە و بڕۆ بەر دەرگەی، ئەوا دەبیتە کۆیلەی).

بە هەمان شێوە ئیحتیاجی و ڕەجای ڕەحمەتی عەبد بۆ خودا، عەبدایەتیی بە دوای خۆیدا دەهێنێت، بە ئەندازەی ئاتاجبوونی عەبد بە خوا، عەبدایەتیی زیاد دەبێت. پشتکردنی دڵ لە خوا و داوانەکردن لە خوا و نەبوونی ڕەجا لە خوا، وا دەخوا ئەم دڵە دوور بکەوێتەوە لە خوا و عیبادەت و بەندایەتیی بۆ خودا. دڵی پەیوەست دەبێت و گرێ دەدرێت بە مەخلوقات لە پلەوپایە و سەربازەکانی و شوێنکەوتووانی و لە خزم و کەس و هاوڕێکانی، سەروەت و سامانی گەورە و سەرۆکەکەی و پاشا و شێخەکەی و، جگە لەمانەش کە مردوون!

خوای پەروەردگار دەفەرموویێت: ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَيِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٨﴾﴾ واتە: (تۆ ئەی محمد ﷺ پشت ببەستە بەو زاتەی کە هەمیشە زیندووە و هەرگیز نامرێت، بەردەوام

(١) رواه إبن إسحاق في "السيرة" (٢/٧٠).

تەسبیحات و سوپاس و ستایشی بکە، ئەوەندە بەسە بۆ ئەو زاتە کە بە هەموو گوناه و تاوانی بەندەکانی ئاگایە و (هیچی لێ پەنهان نییە). [الفرقان: ٥٨].

کاتێك مرۆڤ دڵی پەیوەستە بە دروستکراوەکان و دڵی جێگیر نییە لەسەر پەرستن و ناسینی خوای پەروەردگار، ئەوا هەمیشە دروستکراوەکان دەبنە سەرچاوەی ئومێدی ئەو، ئومێدی سەرخستن و ڕزقوڕۆزی و پشتیوانییان لێ دەکات، چەندە خۆی بە ئاتاج بزانێت لە بەرانبەر غەیری خوا، ئەوا بەم ئەندازەیە بەندایەتیی تێدایە بۆ دروستکراوەکان، هەرچەندە ئەو کەسە لە ڕواڵەتدا کەسێکی گەورە و بەهێز و بەڕێز و فەرماندەر دەربکەوێت! بۆیە مرۆڤی ژیر لە نێوەڕۆکی شتەکان ڕادەمێنێت نەک ڕواڵەتی شتەکان.

ئەگەر پیاو دڵی پەیوەست بوو بە ئافرەتێک، ئەگەر حەڵاڵیشی بێت، ئەوا دڵی ئەم پیاوە کۆنترۆڵ دەکات و ملکەچی خۆی دەکات و دەبێتە کۆیلەی، هەرچەندە لە ڕواڵەتدا ئەم پیاوە مێردی بێت و گەورەی بێت، چ جای ئەوەی ئافرەتەکە بزانێت ئەم پیاوە هیچ بە دیل و جێگرەوەی نییە و تەواو تەواو دڵی پیاوەکە پەیوەستە بەو، ئەوا وای لێ دێت بە ئارەزووی خۆی دەیهێنێت و دەیبات و بەکاری دەهێنێت، کە ناتوانێت ڕزگاری ببێت لێی. چونکە کۆتکردن و کۆنترۆڵکردنی دڵ، زۆر گەورەترە لە کۆتکردن و زنجیرکردنی جەستە. بە کۆیلەکردنی دڵ زۆر گەورەترە لە بە کۆیلەکردنی جەستە. کەسێک دڵی ئارام بێت و ئازاد بێت، جەستەشی بکرێت بە کۆیلە باکی نییە، چونکە لە ناخەوە بەختەوەر و ئاسوودەیە، بەڵام کە دڵ بوو بە کۆیلە و توایەوە بۆ خۆشەویستیی غەیری خودا، ئەمە بریتییە لە زەلیلبوون و کۆیلایەتی، ئەوپەڕی پەرستنە، چونکە دڵ کۆت کراوە.

بەندایەتیی دڵ و کۆیلەبوون و زەلیلبوونی دڵ پاداشت و سزای لەسەر دادەمەزرێت، پاداشت و سزا لەسەر ئەمەیە. بە ڕاستی ئازادی، ئازادیی دڵە و، بەندایەتی، بەندایەتیی دڵە، هەروەکوو چۆن دەوڵەمەندی، دەوڵەمەندیی دڵە.

پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت: (ليس الغِنى عن كثرة العَرَض ولكن الغِنى غِنى النفس) (١)

واتە: (دەوڵەمەندی سەروەت و سامان و هەبووەکانت نییە لە ماددە، بەڵکوو دەوڵەمەندی، دەوڵەمەندیی نەفسە، (واتە: لە ڕووی نەفسی زەلیل و کۆیلە نەبیت بۆ غەیری خودا).

چێژی ئیمان لەو شتانەوە بە دەست دێت کە تۆ دەیبینیت، مرۆڤ کاتێک شوێنی خۆشەویستی تەواوی خوای پەروەردگار دەکەوێت چێژی ئیمان دەکات، چێژی ئیمان شوێن ناسینی و خۆشەویستی تەواو بۆ خوا دەکەوێت، ئەم چێژی ئیمانە بە سێ شت دەست دەکەوێت:

١- تەواوکردنی خۆشەویستی بۆ خودا.

٢- خۆشویستنی ئەوەی کە خودا خۆشی دەوێت.

٣- ڕقلێبوونەوە لەوەی کە خودا خۆشی ناوێت.

تەواوکردنی خۆشەویستیی خودا:

پێویستە مرۆڤ خوا و پێغەمبەری خوای لە هەموو شتێک خۆشتر بووێت. خۆشەویستیی خوا و پێغەمبەری خوا ئەوە نییە خوا و پێغەمبەرت لەگەڵ شتێکی تردا خۆشتر بووێت، بەڵکوو پێویستە خوا و پێغەمبەری خوای لە هەموو شتێک زیاتر خۆش بووێت.

خۆشویستنی ئەوەی کە خودا خۆشی دەوێت: واتە ئەو شتانەی خۆش بووێت کە خوا

(١) البخاري: ٦٤٤٦، والمسلم: ١٠٥١، والترمذي: ٢٣٧٣.

خۆشی دەوێت، هیچ کەسێکی خۆش نەوێت تەنها لەبەر خوای پەروەردگار نەبێت. ڕقی هەیە لە بەرانبەر تاوان دەبێت لەبەر خوا بێت، چاکەی خۆش دەوێت و چاکە دەکات دەبێت لەبەر خوا بێت.

ڕقلێبونەوە و بەرەنگاربوونەوەی ئەو شتەی دژی خۆشەویستیی خوایە: واتا ڕقبوونەوە و خۆشنەویستنی شتێك کە دژی ئیمان بێت، زۆر زیاتر لەوەی کە بخرێتە ناو ئاگر و ئەزیەت بدرێت. کەوابوو خۆشویستنی پێغەمبەر و ئیمانداران ڕەنگدانەوەی خۆشەویستیی خوایە، چونکە خۆشویستنی پێغەمبەر و ئیمانداران بەشێکە لە خۆشەویستیی خوا.

پێغەمبەری خوا ئیماندارانی خۆش دەویست، چونکە خوا ئیماندارانی خۆش دەوێت، پێغەمبەری خوا ئیماندارانی خۆش دەوێت، چونکە بەشێك لە خۆشەویستیی تەواو بۆ خوا بریتییە لە خۆشویستنی ئیمانداران. پێغەمبەری خودا لە هەموو کەس لە پێشترە کە ئیماندارانی خۆش بووێت، چونکە لە هەموو کەس زیاتر خوای خۆش دەوێت. لە هەموو کەس زیاتر ڕقی لەوەیە کە خوا ڕقی لێیەتی. بۆیە خۆشەویستیی تەواو هەر شایستەی پەروەردگارە بە تەنها. پێغەمبەری خودا دەفەرمووێت: (ئەگەر کەسێکم هەڵبژاردبایە و کردبام بە خەلیلی خۆم، ئەوا ئەبو بەکرم دەکردە خەلیلی خۆم) کەواتە خۆشەویستیی تەواو بۆ خوا، گەورەترە لە بەشێك لە خۆشەویستی بۆ خوا.

مەبەست لەمە ئەوەیە کە هەم خۆشەویستی بۆ خوا و خۆشەویستیی تەواو بۆ خوا هەردووکیان لە بازنەی جێبەجێکردنی بەندایەتین بۆ خوا. زۆرێك کەوتوونەتە هەڵە و لەو وەهمەدان کە وا دەزانن بەندایەتی تەنها ملکەچی و خۆ زەلیلکردنە بۆ خوا بەبێ خۆشەویستی.

یان دەکەونە ناو جۆرە خۆشەویستییەك بۆ خودا کە خودا پێی ڕازی نییە و لە شەرعدا جێگەی نابێتەوە. دەبێت مرۆڤ خوای خۆش بووێت و لێشی بترسێت وەکوو ئەمانە نەبێت کە دەڵێن: تەنها خوامان خۆش دەوێت و لێی ناترسین.

لە سەلەف گوتراوە (هەر کەسێك خوا بپەرستێت تەنها بە خۆشەویستی، ئەوا کەسێکە لایداوە) و کەسێك تەنها ڕەحمی خوا وەربگرێت و کار نەکات، ئەوا کەسێکی مورجیئەیە.

هەر کەسێك خوا بپەرستێت تەنها بە ترسان لێی، ئەوا کەسێکی خەواریجە. هەر کەسێك خوا بپەرستێت بە خۆشەویستیی خوا و بە ترس لە خوای گەورە و بە ڕەجای ڕەحمەتی، ئەوا کەسێکی یەکخواپەرست و ئیماندارە.

هەندێك کەس کەوتوونەتە ناو ئەو هەڵەیەی کە دەڵێن: خوا کەس ناکاتە ناو جەهەننەم، ئەمە زۆرێك لە خەڵک تێی کەوتوون، هۆکاری ئەمەش لاوازیی بەندایەتییە، ئەو بەندایەتییەی کە پێغەمبەران هێناویانە و کردوویانە. ئەو ئەمر و نەهییەی کە پێغەمبەران هێناویانە. ئەوانە ئەقڵیان لاوازە، ئەم جۆرە ئەقڵەی کە عەبد حەقیقەتی پێ دەناسێت. ئەگەر ئەقڵ لاواز بوو، زانستی بە دین کەم بوو، خۆشەویستی و ئارەزوویەکیش لە نەفسدا هەبوو، ئەوا ئەوەی نەفس ئارەزووی بکات دەیکات بە دین. هەروەکوو چۆن مرۆڤ دڵخۆشە بە کەسێکی دیکە لە کاتێکدا کەسێکی نەزان و گەمژەیە، بۆیە گێلی و نەزانی لەناوبەری خۆشەویستی نین بۆ شتێک.

دەکرێت مرۆڤ نەزان بێت و بە نەزانی و گەمژەیی خۆی شتێک بکات بە دین و پاشان خۆشی بوێت، نەزانییەکەی ڕێگر نییە لە خۆشویستنی ڕێگە هەڵە و چەوتەکەی. ئەو کەسە دەڵێت: (من خوام خۆش دەوێت، کەواتە خوا سزام نادات) بەڵام ئەمە هەڵەیە، چونکە تەنها خۆشەویستیی خوا بەس نییە بۆ سزانەدان، بەڵکوو دەبێت شوێنکەوتنیشی لەگەڵ بێت.

هاوشێوەی ئەمە ئەو گومڕایی و لادانەیە کە (الیهود و النصاری) تێی کەوتن، کە دەیانگوت: ئێمە منداڵی خواین و خۆشەویستی خوای گەورەین ﴿نَحْنُ أَبْنَاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ﴾ واتە: (ئێمە ڕۆڵەی خوا و خۆشەویست و نزیکی ئەوین.) [المائدة: ١٨].

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ يَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ﴾ واتە: (پێیان بڵێ: کەواتە بۆچی لەسەر گوناه و تاوانتان سزاتان دەدات (لە دونیادا بە ئاشکرا بەڵا و ناخۆشیتان بۆ پێش دەهێنێت، سزای قیامەتیش با لەولاوە بوەستێت، ئێوە خۆتان ئاوا بە گەورە و نازدار دامەنێن و خۆتان جیا مەکەنەوە) نەخێر وا نییە، چونکە ئێوەش بەشەر و ئادەمیزادێکن لەو خەڵکەی کە دروستی کردووە، ئەوەی خوا بیەوێت لێی خۆش ببێت، لێی خۆش دەبێت، ئەوەش کە بیەوێت سزای بدات سزای دەدات (ئەڵبەتە لە چوارچێوەی دادپەروەریدا). [المائدة: ١٨].

سزای خوا بۆ ئەوان، ئەوە دەخوازێت و ئەوە لەخۆ دەگرێت کە ئەوان خۆشەویستی خودا نین، بەڵکوو ئەوانە دروستکراوی پەروەردگارن و منداڵی خودا نین (پەنا بە خوا).

هەر کەسێك خودا خۆشی بووێت، ئەوا خودا لەم شتانەدا بەکاری دەهێنێت و ئاراستەی دەکات و بۆی ئاسان دەکات، کە خۆی خۆشی دەوێت و لێی ڕازییە.

شتێک ناکات کە خوای پەروەردگار لێی ناڕازی بێت و خودا تووڕە بکات، وەکوو کوفر و تاوان و دووڕوویی، هەرکەس وا گومان ببات کە تاوان هیچ زیانی پێ ناگەیەنێت، چونکە خوا ئەوەی خۆش دەوێت! وەکوو ئەوە وایە ژەهر بخوات و چاوەڕێ بێت تەندروستیی باش بێت!! بۆیە مرۆڤی ژیر ئەم قسەیە ناکات.

ئەم کەسە گەمژەیە ئەگەر سەرنجی پێغەمبەران بدات بە چ ناڕەحەتی و ئازارێکدا تێپەڕیون و داوای لێخۆشبوونیان لە خوا کردووە، ئەوان ئەگەر خۆشەویستی خوان ئەی بۆچی داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەن؟! ئەگەر لەوە ڕابمێنێت، ئەوا لە زیانی تاوان خاڵی دەبوو کە چ کاریگەری و جێکەوتی هەیە لەسەر خاوەنەکەی.

خۆشویستنی کەسێک مانای ئەوە نییە ئەوەی ئەنجامی بدەیت هەمووی تەواو ڕەزامەند بێت، بەڵکوو زۆر جار کارێک دەکەیت بە نەزانی و گەمژەیی بەرانبەر

ئەو کەسەی خۆشت دەوێت، ئەمیش ڕقی لێت دەبێتەوە و تۆی خۆش ناوێت. لەسەر بنەمای خۆشەویستی هەمیشە کارەکان ڕاست و دروست نین.

ئەمە هۆکارە بۆ ئەوەی کەسە خۆشویستراوەکە سزای بدات! زۆرێك لەوانەی کە ڕێگەی خوایان گرتووە کەوتوونەتە ناو چەندان هەڵە و نەزانین، لە کاتێکدا بانگەشەی خۆشەویستیی خوا و گەیشتن بە خوا دەکەن، بەڵام لە حەقیقەتدا هەمووی نەزانینە بە دین و کرۆکی ئیسلام.

یان زۆر جار حەقی خوایان کردووە بە حەقی خۆیان! ئەو شتەی تەنها مافی خوایە، ئەوان بە حەقی خۆیانیان زانیوە. یان زۆر جار مافی خوایان نەداوە، یان بانگەشەی ناڕەوا دەکەن.

وەکوو گوتوویانە: (ئەگەر ڕۆژی قیامەت هات، ئەوا چارۆگەکەی خۆم دەدەم بەسەر جەهەننەمدا ناهێڵم کەس بچێتە ناوی!) چەندانی دیکە لەم قسانە کە لە شێخەکانەوە دەردەچێت کە کەسانی دیار و ناسراون لەم جۆرە قسانە دەکەن، یان درۆیەکە بە دەمیانەوە هەڵبەستراوە، یان هەڵەیەکە کە کەوتوونەتە ناوی!

وێنەی ئەم قسانە لە کاتی سەرخۆشی و بێئاگاییدا دێت، کە حاڵەتێکە مرۆڤ جیاکردنەوە و ژیری لە دەست دەدات و نازانێت چی دەڵێت و چیی وتووە.

بێئاگایی: بریتییە لە چێژە لەگەڵ نەبوونی جیاکردنەوەی چاکە و خراپە، کاتێك ئەم مرۆڤە بە هۆش خۆی دێتەوە و قسەکانی دەبینێت کە چیی گوتووە، ئەوا داوای لێخۆشبوونی لە خوا دەکرد.

ئەوانە گوێ لە هۆنراوە و شیعری خۆشەویستی و عیشق دەگرن و دڵیان دەجووڵێت بەرەو خۆشەویست، هەر کەسێک بێت بە گوێگرتن لە هۆنراوە و شیعری خۆشەویستی و عیشق دڵەکەی تووشی دڵپەیوەستبوون و دڵبزوولان دەبێت بەرانبەر بەم شتەی خۆشی دەوێت. بۆیە خوای گەورە ئایەتێکی دابەزاندووە بۆ تاقیکردنەوەی خۆشەویستیی ڕاستەقینە، دەفەرمووێت: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾ واتە: (ئەی پێغەمبەر بە ئیمانداران بڵێ: ئەگەر ئێوە

خواتان خۆش دەوێت دە شوێنی من بکەون و لە فەرمانی من دەرمەچن، ئەو کاتە خوایش ئێوەی خۆش دەوێت). [آل عمران: ٣١].

خۆشویستنی ڕاستەقینەی خوا تەنها بە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوایە. هیچ کەسێک نابێتە خۆشەویستی خوا، ئیللا کەسێک نەبێت کە شوێن پێغەمبەری خوا دەکەوێت.

زۆرێك لەوانەی کە بانگەشەی خۆشەویستی دەکەن، دەرچوون لە شەریعەت و لایان دا. بانگەشەی هەندێك شت دەکەن کە لێرە باسکردنی درێژە دەکێشێت و جێگای باسکردن نییە. هەندێکی تر وا گومان دەبەن کە هیچ فەرمانێك لەسەر ئەو نەماوە و هەموو شتێکی حەرامی بۆ حەڵاڵە.

خوای پەروەردگار ئەوەی داناوە کە بنچینەی خۆشەویستیی خوا و پێغەمبەرەکەی بریتییە لە جیهاد لەپێناوی.

جیهاد "تێکۆشان لەبەر خوا" ئەوپەڕی خۆشویستنی خوا لەخۆ دەگرێت. جیهاد لە بەرانبەر ئەو شتانە دەکرێت کە خوا زۆر ڕقی لێیەتی و دوژمنی خوان. جیهاد بۆ نەمانی ئەو شتانەیە کە خوا ڕقی لێیەتی، جیهاد ئەوپەڕی خۆشەویستییە بۆ خوا. بۆیە خوای گەورە دەربارەی ئەوانەی خوایان خۆش دەوێت و خواش ئەوانی خۆش دەوێت، دەفەرمووێت: ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لائِمٍ﴾ واتە: (هەروەها ملکەچ و فەرمانبەردار و بەسۆزن بۆ ئیمانداران و سەربڵند و نەخۆر و دەروونبەرزن بەسەر بێباوەڕاندا، لەپێناو ڕێبازی خوا و بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی ئەو هەوڵ دەدەن و خەبات دەکەن و تێدەکۆشن، لە لۆمەی لۆمەکەرانیش ناترسن (ئەم خۆشەویستی و هەڵبژاردن و سۆز و تێکۆشانە). [المائدة: ٥٤].

بۆیە خۆشەویستیی ئەم ئوممەتە بۆ خوا لە پێشترە لە خۆشەویستیی ئوممەتانی پێشووتر بۆ خوا. بەندایەتیی ئەم ئوممەتە تەواوترە لە بەندایەتیی ئوممەتانی پێشووتر.

ئەو چینەی کە خاوەنی تەواوترین خۆشەویستین بۆ خوا لەم ئوممەتەدا هاوەڵانن و ئەوانەی کە هاوشێوەی ئەوانن.

ئەوانەی بانگەشەی خۆشەویستیی خوا دەکەن لە کوێی جیهاددان؟ کوا جیهادیان؟! [مەبەستی سۆفییەکانی سەردەمی خۆیەتی کە بانگەشەی خۆشەویستیی خوایان دەکرد و جیهادیان نەدەکرد]. بۆیە خۆشەویستیی خوا تەنها بانگەشە نییە!

خۆشەویستیی خوا ئەوە لە خۆی دەگرێت کە ڕقت لەو شتە بێت کە خوا ڕقی لێیەتی و پێغەمبەری خوا ڕقی لێیەتی و، جیهادکردن لە بەرانبەر ئەو شتانەی کە خوای پەروەردگار ڕقی لێیەتی و، هەم بە نەفس و هەم بە ماڵ دەبێت جیهادیان بکەیت.

ئەوانەی دەڵێن مادام خوا هەموو شتی دروست کردووە دەبێت خۆشمان بوویت، هەتا کوفر و تاوانیش، ئەوانە هەڵەن و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بە گومڕاییدا دەچن، چونکە خودا بە کوفر و دووڕوویی و تاوان و گوناح ڕازی نییە و ڕقی لێیەتی.

شوێنکەوتنی شەریعەت و جیهادکردن لە گەورەترین جیاکەرەوەکانی نێوان ئەو کەسانەن کە دەڵێن: خوامان خۆش دەوێت و خواش ئەوانی خۆش دەوێت، لەگەڵ ئەوانەی تەنها بانگەشەی خۆشەویستیی خوا دەکەن. کەواتە ئەوانەی خوایان خۆش دەوێت و خواش ئەوانی خۆش دەوێت،

بەوە جیا دەکرێنەوە کە پابەندی شەریعەتن و شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوان و جیهاد دەکەن و، ئەوانەی تەنها بانگەشەی خۆشەویستیی خوا دەکەن جیهاد و شوێنکەوتنی شەریعەتیان نییە، ئەمە جیاکەرەوەی نێوانیانە.

ئەم جۆرە بانگەوازە هاوشێوەی بانگەوازی (یەهود و نەصارایە) کە بانگەشەی خۆشەویستیی پەروەردگاریان دەکرد، هەندێك جار ئەوانە خراپترن لە یەهود و نەصارا، چونکە دووڕوویی لەناو پەیامەکەیاندا هەیە، بەمەش لە خواری خوارەوەی ئاگرن.

لە تەوڕات و ئینجیلدا هاتووە لەسەر خۆشەویستی لە تەوڕات و ئینجیلدا هاندان هەیە بۆ خۆشویستنی خوای پەروەردگار، یەهود و نەصارا لەسەر ئەوە کۆکن و ئەمە گەورەترین وەسیەت و ئامۆژگاریی کتێبەکانیانە. لە ئینجیلدا هاتووە: (گەورەترین وەسیەتی مەسیح ئەوەیە کە خوای پەروەردگارت خۆش بووێت بە هەموو دڵ و ئەقڵ و نەفست) و، نەصاراکان بانگەشەی خۆشەویستیی خوا دەکەن و عیبادەت و زوهدیشیان هەیە! بەڵام ئەوانە زۆر زۆر دوورن لە خۆشەویستیی خوا، چونکە شوێن ئەوە نەکەوتوون کە خوا خۆشی دەوێت.

﴿اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ﴾ واتە: (بۆیە بەسەریاندا دێت، چونکە ئەوانە شوێنی ئەو شتانە کەوتبوون کە قین و خەشمی خوا دەبزوێنێت، ئەوانە بێزاربوون لە ڕەزامەندیی خوا، خوایش کاروکردەوەیانی پووچ و بێ ئاکام کرد). [محمد: ٢٨].

پەروەردگار ڕقی لە کافرەکانە، خوای پەروەردگار نەعلەتیان لێ دەکات، خوای پەروەردگار ئەو کەسەی خۆش دەوێت کە خوای گەورەی خۆش دەوێت. ناکرێت عەبد خوای خۆش بووێت و خوا عەبدی خۆش نەوێت، بەڵکوو خۆشەویستیی خوا بۆ عەبد زۆر زیاترە، (مَن تَقَرَّبَ إليَّ شِبراً تقرَّبتُ إلَيهِ ذِراعاً، ومَن تَقَرَّبَ إليَّ ذِراعاً تَقَرَّبتُ إلَيهِ باعاً، ومَنْ أتَاني يَمشي أتَيْتُهُ هَرْوَلَةً) (١)

واتا: (ئەگەر بەندەکەم (هێندەی) بستێک لە من نزیک بێتەوە، ئەوا من (هێندەی) باڵێک لێی نزیک دەبمەوە و، ئەگەر (هێندەی) باڵێک لێم نزیک بێتەوە، ئەوا من (هێندەی) دوو باڵ لێی نزیک دەبمەوە و، ئەگەر بە ڕێکردن بۆ لای من بێت، ئەوا من بە هەروەلە بۆ لای ئەو دێم). (هەروەلە: جۆرێکە لە ڕاکردن، بەڵام بە شێوەیەکی مامناوەند نە ڕێکردن و نە ڕاکردنی خێرایە).

(١) رواه البخاري/١٣/٣٢٥، ومسلم ٢٦٧٥

خوای پەروەردگار هەواڵی داوە کە کەسی خۆپارێز لە تاوانی خۆش دەوێت، کەسی چاکەکاری خۆش دەوێت، کەسی ئارامگر و تەوبەکاری خۆش دەوێت و، کەسی دوورەپەرێزی لە تاوان خۆش دەوێت و، ئەو کەسەی خۆش دەوێت کە فەرمانەکانی خوا جێبەجێ دەکات و دوور دەکەوێتەوە لەو شتانەی خوا قەدەغەی کردووە و، جێبەجێکردنی سوننەتەکانی خۆش دەوێت، وەکوو لە فەرموودەی (الصحيح)دا هاتووە (لَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إليَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتَ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ) (١)

واتا: (هیچ شتێک نییە بەندەکەم بە هۆیەوە لێم نزیک ببێتەوە وەکوو ئەوەی پێم خۆشە بە فەرزەکان ئەنجامی بدات، بەردەوامیش بەندەکەم لێم نزیک دەبێتەوە بە کردنی سوننەتەکان، هەتاوەکوو دەگاتە ڕادەیەک خۆشم بووێت، ئیتر ئەو کاتە دەبمە ئەو گوێیەی پێی دەبیستێت و ئەو بینینەی پێی دەبینێت).

بۆیە دینی ڕاست تەنها جێبەجێکردنی تەوحیدە بۆ خوای گەورە، خۆشەویستیی خوا بۆ عەبدەکەی بە ئەندازەی کامڵبوونی خۆشەویستیی عەبدە بۆ پەروەردگار، خۆشەویستیی خوا بۆ عەبدەکەی بە ئەندازەی خۆشویستنی عەبدە بۆ خوا.

چەندە کەموکووڕی هەبێت لە تەوحیددا، بەم ئەندازەیە کەموکووڕی پەیدا دەبێت لە جێبەجێکردنی بەندایەتی بۆ خوا.

هەر خۆشەویستییەك بۆ غەیری خوا بێت، ئەوا خۆشەویستییەکی ناڕەوا و پووچە. هەر کردەوەیەك و قسەیەکیش مەبەست پێی ڕازیکردنی پەروەردگار نەبێت، ئەوا پووچ و بەتاڵە.

چونکە دونیا نەفرەتلێکراوە و ئەوەش کە تێیدایە نەفرەتلێکراوە، ئیللا ئەو شتە نەبێت کە بۆ خوایە و لەبەر خوایە، هیچ شتێکیش بۆ خوا نابێت ئیللا ئەوە نەبێت کە خوا و پێغەمبەر خۆشیان بووێت. ئەمەش بریتییە لە دین.

---

(١) رواه البخاري ٦٥٠٢

هەر کارێك بۆ جگە لە خوا بکرێت خوای گەورە نایەوێت، هەر کردەوەیەکیش لەگەڵ شەریعەتەکەی نەگونجا وەری ناگرێت و قوبووڵ نییە، کردەوە نابێتە ئەو کردەوەیەی کە خوا وەری بگرێت ئیللا دەبێت ئەم دوو وەسف و تایبەتمەندییەی تێدا بێت:

١- دەبێت بۆ خوا بێت.

٢- دەبێت بە گوێرەی سوننەتی پێغەمبەری خوا بێت و خوا و پێغەمبەری خوا ئەم کردەوەیەیان پێ خۆش بێت، ئەمەش یان کردەوەکە واجبە یان سوننەتە. ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلا صَالِحًا وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾ واتە: (جا ئەوەی دەیەوێت بە دیداری پەروەردگاری شاد ببێت، بە خۆشنودییەوە با کاروکردەوەی چاك و دروست ئەنجام بدات و بە هیچ شێوەیەك لە پەرستندا هیچ کەسێك نەکاتە هاوەڵ و شەریك بۆی). [الكهف: ١١٠].

بۆیە کرداری چاک یان واجبە یان سوننەتە، دەبێت ئەم کردەوەیەش تەنهاوتەنها بۆ خوای پەروەردگار ئەنجام بدرێت و تەنها مەبەست ڕازیکردنی ئەو بێت و پاککرابێتەوە لە مەبەستی غەیری خوا. ﴿بَلَى مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِندَ رَبِّهِ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ واتە: (نەخێر، وا نییە، هەرکەس بە ڕاستی خۆی بداتە دەست خوا و لە هەمان کاتدا چاکەکارو موسڵمان بێت، ئەوا پاداشتی خۆی لای پەروەردگاری دەست دەکەوێت و نە ترسیان دەبێت و نە غەم و پەژارە دایان دەگرێت). [البقرة: ١١٢].

پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت: (من عمل عملاً ليس عليه امرنا فهو رد) [1]

واتە: هەر کەسێك کردەوەیەك "عیبادەتێك" بکات و فەرمانی ئەم دینەی ئێمەی لەسەر نەبێت، ئەوا لێی وەرناگیرێت.

---

(١) أخرجه مسلم ٢٦٩٧

دەفەرمووێت: (إنما الأعمال بالنيات و إنما لكل امرئ ما نوى، فمن كانت هجرته إلى الله ورسوله، فهجرته إلى الله ورسوله، ومن كانت هجرته لدنيا يصيبها أو امرأة ينكحها، فهجرته إلى ما هاجر إليه)[١] واتا: (لە ڕاستیدا هەموو کردار و ڕەفتارەکان بە نیازی دڵن، هەر کەسێک بە نیازی دڵی خۆی لای خوا پاداشتی دەست دەکەوێت، هەرکەس کۆچەکەی بۆ شتیکی دونیایی بێت کە دەستی بکەوێت یان بۆ ئافرەتێک بێت کە مارەی بکات، ئەوە کۆچەکەی بۆ ئەوە بووە کە کۆچی بۆ کردووە واتە (مەبەستی ڕەزامەندیی خوا نەبووە و لای خوا هیچ پاداشتێکی دەست ناکەوێت).

کەواتە کاکڵە و کرۆکی دین لەسەر دوو بنچینەیە:

١. هیچ کەس و هیچ شتێک نەپەرستین تەنها (الله) نەبێت.

٢. بەو شێوەیەش بیپەرستین کە خۆی بۆی داناوین. پێغەمبەرانیش هەر بۆ ئەوە هاتوون و بۆ ئەوەش جیهادیان کردووە و هانی خەڵکیشیان داوە لەسەر ئەمە.

بۆیە هەموو دین بە دەوری ئەم دوو بنچینەدا دەسووڕێنەوە. شیرک یەکێکە لەو شتانەی زاڵە بەسەر نەفسەکاندا، وەکوو لە فەرموودەدا هاتووە (لە ترپەی پێی مێرووله لە شەوێکی تاریکدا زۆر شاراوەترە).

لە فەرموودەی تردا هاتووە ئەبو بەکری ڕاستگۆ دەفەرمووێت: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە چۆن ڕزگارمان بێت لە شیرکی شاراوە، لە کاتێکدا ئەو زۆر شاراوەترە لە شوێن پێی مێرووله لە شەوێکی تاریکدا؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی: (دەتەوێت وشەیەکت فێر بکەم تاوەکوو ڕزگارت بێت لە شیرکی شاراوە و ئاشکرا) بڵێ: (اللهم إني أعوذ بك أن أشرك بك وأنا أعلم، وأستغفرك لما لا أعلم). واتە: (خودایە پەنات پێ دەگرم لە شیرکێک کە من دەیزانم و هەستی پێ دەکەم و داوای لێبووردنت لێ دەکەم لەوەی کە نایزانم).

---

(١) أخرجه مسلم (١٩٠٧)، البخاري (١) و (٥٤).

عومەری کوڕی خەتتاب لە دوعاکانیدا دەیفەرموو: (اللّهمَّ اجعَلْ عَمَلي كلَّه صالِحاً، واجعَلْهُ لوَجْهِكَ خالِصاً، ولاتَجعلْ لأَحَدٍ فيه شيئًا). زۆر جار شەهوەتی شاراوە تێکەڵی نەفس دەبێت و حەز دەکات پێشچاوی بکات و ڕیایی بکات، بۆیە جێبەجێکردنی بەندایەتیی لێ تێك دەچێت و قورس دەبێت، خۆشەویستیی بۆ خوای پەروەردگار لاواز دەکات و ناتوانێت بە تەنهاوتەنها کردارەکانی بۆ خودا ئەنجام بدات، نیەتپاکی لە کردەوەکانی لێ تێك دەچێت و لاواز دەبێت. وەکوو (شەدادی کوڕی ئەوس) دەڵێت: (ئەی هاوار ئاگادار بن! ئەو شتەی زۆر لێی دەترسم بۆتان ڕیا و شەهوەتی شاراوەیە). دەربارەی (شەهوەتی شاراوە) پرسیاریان لە (ئەبی داودی سجستانی) کردووە ئایا شەهوەتی شاراوە چییە؟ (مالشَّهوةُ الخفيَّةُ؟) ئەویش لە وەڵامدا گوتوویەتی: (خۆشویستنی دەسەڵات و پلەوپایەیە).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (ما ذِئبانِ جائعانِ أُرْسِلا في غَنَمٍ، بأفسدَ لَها من حِرصِ المَرءِ علَى المالِ والشَّرَفِ لدينِهِ)[1]

واتە: زیانی دوو گورگی برسی کاتێك بەڕەڵا دەکرێن بۆ ناو ڕانەمەڕێك زیانیان زیاتر نییە لە زیانی سووربوون و چڵێسیی مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی ماڵ و پلە و پۆست و کاربەدەستایەتی. کە بێگومان ئەم دوو شتە زیانی زۆریان هەیە بۆ دینی خاوەنەکەی.

پێشەوا ئیبن ڕەجەب "ڕەحمەتی خوای لێ بێت" فەرموویەتی: ئەم فەرموودەیە نموونەیەکی زۆر گەورەیە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتەوە بۆ تێکدانی دینی کەسی موسڵمان بە هۆی تەماع و چڵێسی بۆ ماڵ و سامان و پەلە و پۆست، کە ئەم دوو سیفەتە خراپە زیانیان بۆ دینی کەسی موسڵمان کەمتر نییە لە زیانی دوو گورگی برسی لەسەر ڕانەمەڕێك.

پێشەوا مەناوی "ڕەحمەتی خوای لێ بێت" فەرموویەتی: مەبەستی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە کە چڵێسی و چاوچنۆکی بۆ بەدەستهێنانی ماڵ و پلە و

---

(١) صحيح الترمذي.

پۆست و کەسایەتی زیانیان زۆر زیاترە لە زیانی دوو گورگی برسی بۆ سەر ڕانەمەڕێك!

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر "ڕەزای خوایان لێ بێت" لە باوکی خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێت گوێم لە عومەری کوڕی خەتاب بوو "ڕەزای خوای لێ بێت" دەیفەرموو: (پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی پێ بەخشیم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ماڵە بە کەسێکی تر ببەخشە کە لە من هەژارتر و موحتاجتر بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وەری بگرە، هەر کاتێك ماڵێکت پێ بەخشرا بێ ئەوەی خۆت داوات کردبێت و تەماعت هەبووبێت ئەوا وەری بگرە و، کاتێك پێت نەبەخشرا ئەوا نەفسی خۆتی بۆ ماندوو مەکە و داوای مەکە).(١)

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە کەسی موسڵمان نابێت لە خەڵك بپاڕێتەوە و چاوچنۆك و چڵێس بێت.

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لَوْ كانَ لابْنِ آدَمَ وادِيانِ مِن مالٍ لابْتَغَى وادِيًا ثالِثًا، ولا يَمْلأُ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إلَّا التُّرابُ)(٢)

واتە: ئەگەر بەنی ئادەم دوو دۆڵ لە ماڵ و سامانی هەبێت، ئەوا داوای دۆڵی سێیەمیش دەکات، هیچ شتێکیش سکی بەنی ئادەم پڕ ناکات تەنها خۆڵ نەبێت "تەنها مردن ئەو چڵێسییەی لە لا ناهێڵێت". پێشەوا ئیبن بەتاڵ "ڕەحمەتی خوای لێ بێت" فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەم فەرموودیەدا بە نموونە ئاماژەی بە خراپیی چڵێسی کردووە بۆ بەدەستهێنانی ماڵی دونیا، بۆیە پێشینە چاکەکان زۆر خۆیان لە ماڵ و سامانی دونیا دەپاراست و کەسانێکی بە قەناعەت و دونیانەویستبوون، پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای بە خوا دەگرت لە خراپەی دەوڵەمەندی و فیتنەی ماڵ و سامانی دونیا. (وەرگێڕ)].

---

(١) صحيح مسلم.
(٢) متفق عليه

دینی ساغ ئەو سووربوون و چڵێسییەی تێدا نییە، مرۆڤ هەردەم بە دوای ماڵ و سەروەت و سامان و ناو و ناوبانگەوە بێت لەناو خەڵکیدا، ئەگەر دڵ چێژی بەندایەتی و خۆشەویستیی خوای چەشت، ئەوا هیچ شتێک لە دڵیدا پێشی خوا ناخات و خۆشەویستیی خوا پێشی هەموو شتێک دەخات لە دڵیدا، بەمەش خودا خراپە و تاوان لەسەر ئەم بەندەیەی لا دەبات و دەیپارێزێت، یارمەتیی دەدات کە ڕقی لەسەر ئەنجامی خراپیی تاوان بێت و لێکەوتەکانی دوای تاوان بە هەند وەربگرێت، چونکە عەبدێکی ڕاستی خۆیەتی، بە هۆی نیەتپاکی و بەس بۆ خوابوونی خوا وەری دەگێڕێت لە تاوان و لادان ﴿كَذَلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ﴾ واتە: (ئا بەو شێوەیەمان کرد بۆ ئەوەی هەرچی گوناهـ و تاوان و خراپەیە لێی دوور دەخەینەوە و بە ڕاستی ئەو لە بەندە هەڵبژاردە و پاکەکانی ئێمەیە). [یوسف: ٢٤].

کەسی دڵسۆز بۆ خوا تامی ئیمانی چەشتووە، تامی عیبادەت و بەندایەتیی بۆ خوای پەروەردگار چەشتووە، ئەم چێژ و حەلاوەی ئیمانە ڕێگریی لێ دەکات کە بۆ غەیری خوا دڵی بە فیڕۆ بدات و بۆ غەیری خوا عیبادەت بکات و بۆ غەیری خوا زەلیل و ملکەچ ببێت. بە لای دڵ خۆشەویستترین شت دەبێتە دڵسۆزی بۆ خوا و بە تەنها پەرستنی پەروەردگار.

ئەم دڵە هەمیشە دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا و پەیوەستە بە پەروەردگار، هەمیشە چاوی لە ڕەحم و بەزەییی خوای پەروەردگارە و لە خوای پەروەردگاریش ترسی هەیە ﴿مَنْ خَشِيَ الرَّحْمَن بِالْغَيْبِ وَجَاءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ﴾ واتە: (هەرکەس لە خوای میهرەبان بترسێت و لە پەنهاندا خۆی لە گوناهـ بپارێزێت و بە دڵێکی بە ئاگا و تەوبەکارەوە بۆ بارەگەی خوا بگەڕێتەوە.. (جا بەو بەختەوەرانە دەوترێت: هەمووتان بڕۆنە ناو بەهەشتەوە). [ق: ٣٣].

هیچ کەسێک نابێتە خۆشەویستی خوا ئەگەر لەنێوان (خەوف و ڕەجا)ـی خوای پەروەردگار نەبێت. ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ

أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ إِنَّ عَـذَابَ رَبِّـكَ كَـانَ مَحْـذُورًا﴾ واتە: (ئا ئەوانەی کە ئەوان هاناوهاواریان لێ دەکەن، کامیان لە خوا نزیکترە؟! لە کاتێکدا کە ئـەوان خۆیـان هـاوار لـە خـوا دەکـەن و داوای نزیکبوونـەوە لـە پـەروەردگاریان دەخوازن و چاوەڕوانی ڕەحمەتی دەکەن، لـە سزا و تۆڵەشی دەترسـن، بە ڕاسـتی سزای پەروەردگارت مەترسیی لێ کراوە). [الإسراء: ٥٧].

هەر کەسێک دڵسۆز بـوو بـۆ پەروەردگـار، خـوای گەورە جیـای دەکـاتەوە لە عەبـدەکانی تـری و دەیکـات بە خۆشەویسـتی خـۆی، هۆشـیاریی پـێ دەدات و دڵزینـدووی دەکـات، ڕای دەکێشێت بـۆ کـاری بـاش و چـاک و یـاد و عیبادەتی ئەو، ئارامی و بەختەوەری دەخاتە قووڵاییی ناخی، هەمیشـە شـاد دەبێت، هەمیشە پڕ ئومێد و پڕ هیممەت دەبێت، هەر شتێک خۆشەویستیی خوای لـێ تێک بدات خـوای پەروەردگـار لە دڵیـدا دەری دەهێنێـت لە خـراپە و تـاوان و مەیلـی خـراپ و سـەرپێچی. بەنـدەی دڵسـۆز هەمیشـە ترسـی هەیە لەو شـتانەی کە پـێچەوانەی دڵسۆزی بن و دڵسۆزییەکەی لەناو دەبەن یان لاوازی دەکەن!

ئەگەر دڵ پەیوەست نەبوو بە خوا، ئیللا دەبێتە کۆیلە و ملکەچی شتێکی تـر. ئەوەی حەز و ئارەزووەکانی دەکاتە پەرستراوی خۆی و هەمیشە گوێڕایەڵیی هەوا و ئارەزووەکانیەتی، ئەوا کەسێکی لادراو و گـومڕایە. هەر کەسێك خـۆی تـایبەت نەکرد بۆ خوا و تەنها دڵی خوای تێدا نەبوو هەمیشە بەندەی دروستکراوەکانی تـرە و، شەیتانیش دەست دەگرێت بەسەر دڵیدا و دەکەوێتە ناو قووڵاییی گوناح و تاوان. ئەمەش شتێکی زانراوە و پێویست بە ڕوونکردنەوە ناکات.

دڵ ئەگەر پـاک نەبـوو بـۆ خـوا و ڕووی تەنهـا لە خـوا نەبـوو، ئەوا دەبێـتە هاوبەشبڕیاردەر، بۆیە خـوای گەورە داوامـان لـێ دەکـات تەنها ڕوو بکەیـنە ئەو بە تەنهاوتەنهـا هـیچ شـتێکی تـر لـەگەڵ ئەودا لە دڵ جـێ نەکەیـنەوە و زەلیلـی بـین. ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّـاسَ عَلَيْهَـا لا تَبْـدِيلَ لِخَلْـقِ اللَّـهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِـنَّ أَكْـثَرَ النَّـاسِ لا يَعْلَمُـونَ * مُنِيبِـينَ إِلَيْـهِ وَاتَّقُـوهُ وَأَقِيمُـوا الصَّلاةَ وَلا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ * مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا كُـلُّ حِـزْبٍ

بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ﴾ واتە: (ئەی مرۆڤ بە دڵێکی پاك و بێگەردەوە) ڕوو بکەرە بەرنامە و ئاییینی خوا و ئەملاولا مەکە، خەڵکینە ئێوەش پابەندی ئەو نەخشەیە بن کە خوا ئێوەی لەسەر دروست کردووە (واتە قورئان کەتەلۆگ و نەخشەی ژیانی ئادەمیزادەکانە و لێی لامەدەن)، هیچ جۆرە گۆڕانکارییەك لە هیچ نەخشە و دروستکراوێکی خوادا نییە، ئا ئەوەیە دینی ڕاست و دروست، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستییانە نازانن. * خەڵکینە: ڕوو بکەنە پەروەردگارتان، بە ملکەچی بگەڕێنەوە بۆ لای، لەو بترسن و خۆتان لە سزای بپارێزن، نوێژەکانیشتان بە چاکی ئەنجام بدەن، مەبن بەو کەسانەی کە شەریك و هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن. *.لەوانەی کە ئایینەکەیان بەش بەش کردووە و بوونەتە چەندەها گرۆ و دەستە (بڕوایان بە هەندێکی هەیە و بڕوایان بە هەندێکی نییە و کوێرانە شوێن ڕابەرەکەیان دەکەون) هەر گرۆ و کۆمەڵێکیش دڵخۆشن بە بەرنامە و نەخشە و پلان و ڕێککەوتنەکانی خۆیان (وا دەزانن چاکترین ڕێبازیان گرتووەتەبەر). [الروم: ٣٠-٣٢].

خوای پەروەردگار ئیبراهیم و ئالی ئیبراهیمی کردووەتە سەرمەشقی یەکخواپەرستان، ئەوانەی کە تەنها خوا دەپەرستن و تەنها ئەهلی خوای گەورەن و، تەنها بۆ خوا عیبادەت دەکەن. هەروەکوو چۆن خوای گەورە فیرعەون و ئالی فیرعەونی کردووە بە سەرمەشقی موشریکەکان! ئەوانەی کە هەوا و ئارەزووی خۆیان کردووە بە خوا و، ئیبراهیم و ئالی ئیبراهیمی کردووەتە سەرمەشقی یەکخواپەرستان.

خوای پەروەردگار دەربارەی ئیبراهیم دەفەرموویت: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً وَكُلا جَعَلْنَا صَالِحِينَ * وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِمْ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ وَإِقَامَ الصَّلاةِ وَإِيتَاءَ الزَّكَاةِ وَكَانُوا لَنَا عَابِدِينَ﴾ واتە: (هەروەها ئێمە ئیسحاقمان بەخشی بە ئیبراهیم و یەعقوبیش بە نەوەی (وەک زیادەڕێزێک بۆ ئیبراهیم)، هەر یەک لەوانمان کرد بە پیاوچاک و خواناس. * هەموو ئەوانیشمان کردە پێشەوا و بە فەرمانی ئێمە ڕێنموویی خەڵکیان دەکرد و

نیگامان بۆ کردن بە ئەنجامدانی کاروکردەوە چاکەکان و ڕاگرتنی نوێژ و زەکاتدان، (بە ڕاستی) ئەوان هەر ئێمەیان دەپەرست و هەر بەندایەتیی ئێمەیان دەکرد). [الأنبياء: ٧٢-٧٣].

دەربارەی فیرعەون و قەومەکەی دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ لا يُنصَرُونَ * وَأَتْبَعْنَاهُمْ فِي هَذِهِ الدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ هُم مِّنَ الْمَقْبُوحِينَ﴾ واتە: (ئێمە ئەوانمان کرد بە چەند پێشەوایەك کە بانگی خەڵکی دەکەن بۆ ناو ئاگر، لە ڕۆژی قیامەتیشدا سەرکەوتوو نابن. * هەر لەم دونیادا نەفرینمان خستە شوێنیان، لە ڕۆژی قیامەتیشدا ئەوانە زۆر ئێسکتاڵ و ڕووخسار ناشیرینن). [القصص: ٤١-٤٢].

ئەهلی گومڕا لە کافران و ئەوانەی شوێن فیرعەون دەکەوتن لە گومڕا و کافر و موشریکەکان و سەرلێشێواوان جیاوازییان نەدەکرد لەنێوان شەریعەتی خوا و قەدەری خوا! [شەریعەت خوا لە هەمووی ڕازییە و خۆشی دەوێت، بەڵام قەزا و قەدەر مەرج نییە خوا هەمووی خۆش بووێت و لێی ڕازی بێت، چونکە خێر و شەڕ و کوفر و ئیمانی تێدایە]. گومڕاکان دەڵێن: خوا ئەوەی قەدەری کردبێت خۆشی دەوێت، جیاوازییان نەدەکرد لەنێوان قەدەر و قەزای خوا و شەریعەتەکەی!

ئەهلی گومڕا و شوێنکەوتووانی فیرعەون دەڵێن: ئەوەی خوا ویستی هەبووبێت لەسەر بوونی، ئەوا خوا خۆشی دەوێت، جا ئەو شتە کوفر بێت یان تاوان. هەروەها ئەوان جیاوازی ناکەن لەنێوان خالق و مەخلوقدا، وای دادەنێن کە بوونی خوا بوونە و بوونیش بوونی خوایە! واتە بوون هەمووی خوایە و خواش هەموو بوونە!

هەموو شتێك یەك شتە ئەویش خوایە! لە سۆفییە موحەقیقەکانیان (ڕادۆزەکانیان/توێژەرەکانیان) دەڵێن: شەریعەت هەم گوێڕایەڵیی تێدایە هەم سەرپێچیی تێدایە، حەقیقەت سەرپێچیی تێدایە بەبێ گوێڕایەڵی، تەحقیق گوێڕایەڵی و سەرپێچیی تێدا نییە. [ئەم دابەشکردنە دابەشکردنی سەرانی سۆفین کە خەڵکی دەکەن بە سێ ئاست].

١- خەڵکی گشتی، ئەوانە ئەهلی شەریعەت دەگرێتەوە کە گوێڕایەڵییان هەیە بۆ خوا و سەرپێچییشیان هەیە.

٢- خەڵکی تایبەت، ئەوانە ئەهلی حەقیقەتن تاوانیان نییە، بەڵکوو هەموو شتێك کە دەیکەن عیبادەتە، ئەگەر زینا و دزیکردنیش بێت، چونکە پێیان وایە ئەمە قەدەری خوایە لەسەریان و خواش ئەوەی قەدەر بکات پێی خۆشە و لێی ڕازییە.

٣- خەڵکی تایبەتی تایبەت، ئەوانە ئەهلی حەقیقەتن، ئەوانە گوێڕایەڵ و سەرپێچییان نییە، چونکە ئەوانە گەیشتوون بە خوا و هیچ تەکلیفی شەرعییان لەسەر نەماوە]. ئەم بیروباوەڕ و دابەشکارییەی سۆفییان کتومت جێبەجێکردنی ڕێبازی فیرعەون و گەلەکەیەتی! ئەوانەی کە ئینکاریی ئەوەیان کرد کە موسا قسەی لەگەڵ خوا کردبێت و خوا ئەمر و نەهیی بۆ ناردبێت.

# جیاوازیی نێوان دروستکەر و دروستکراو

ئیبراهیم و ئالی ئیبراهیم لە پێغەمبەران و ئیمانداران، ئەوان دەزانن کە پێویستە جیاوازی بکەیت لەنێوان دروستکەر و دروستکراودا، لەنێوان گوێڕایەڵی و سەرپێچیدا. مرۆڤ هەر کاتێک بە باشی ئەم جیاوازییانەی زانی و جێبەجێی کرد، ئەوا خۆشەویستی و بەندایەتیی بۆ خوای پەروەردگار زیاد دەبێت، گوێڕایەڵی و ملکەچیی بۆ خوا زیاد دەکات، هەروەها پشتی دەکاتە هەموو شتێك کە پێچەوانەی بەندایەتیی ڕاستەقینەیە، گوێڕایەڵیی بۆ غەیری خودا نییە. ئەوانەی موشریکن جیاوازی ناکەن لەنێوان خاڵق و مەخلوق، بەڵکوو لە لایان یەکسانە! ئیبراهیم خەلیل دەفەرمووێت: ﴿أَفَرَأَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ * أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمُ الْأَقْدَمُونَ * فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّي إِلَّا رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ واتە: (باشە ئاخر ئێوە نابینن چی دەپەرستن (کەی ئەو شتانە شایستەی پەرستنن) * بە ڕاستی ئێوەش و باب و باپیرانی دێرینیشتان (بە هەڵەداچوون) * بێگومان هەموو ئەوانە دوژمنی منن، بە دوژمنی خۆمیان دەزانم جگە لە پەروەردگاری جیهانەکان..). [الشعراء: ٧٥-٧٧].

ئەوانە دەست دەگرن بە قسەی لێکچوو و مانا لێڵ لە قسەی شەیخەکانیان هەروەکوو نەصاراکانیش ئەوەیان کردووە.

نموونەی ئەمەش چەمکی (فەنابوونە). [تێکەڵبوونە لەگەڵ خوا] کە سێ جۆرە:

١- بۆ بەندە تەواوەکانە لە خۆشەویستانی خوا و پێغەمبەران.

٢- بۆ ئەوانەیە کە مەبەستیان خوای پەروەردگارە و دەیانەوێت بگەن بە حەق لە ئەولیاکان و چاکەکاران.

٣- بۆ ئەوانەی کە دووڕوو و مولحیدن و ئەوانەی حەق و ناحەقیان تێکەڵ کردووە.

جۆری یەکەم: جۆری یەکەمیان لە فەنابوون ئەوەیە کە ئیرادەت تەنها بۆ خوا بێت و جگە لە خوا هیچ کەسێکی تری خۆش نەوێت. هیچ کەسێکیش ناپەرستێت تەنها پەروەردگار نەبێت، پشتیش تەنها بە خوا دەبەستێت، داوا لە غەیری خواش ناکات و خۆشەویستیی یەکەمی تەنهاوتەنها خوایە، داوا لە کەس ناکات تەنها خوا نەبێت، ئەم جۆرە فەنابوونە لە قسەی شێخ (أبي نريد) زیاتر دەردەکەوێت و مەبەستەکە ڕوونتر دەکاتەوە کە دەڵێت: (أريدُ أنْ لا أُريد إلا ما يريدُ) واتە: (ئەمەوێت هیچ شتێکم نەوێت، تەنها ئەو شتە نەبێت کە خوا دەیەوێت). دەمەوێت ئەم شتەم بووێت کە خوا خۆشی دەوێت و لێی ڕازییە، تەواوبوونی بەندایەتیی عەبد و کامڵبوونی عەبد لەوەدایە کە تەنها ئەوەی بووێت کە خوا دەیەوێت!

هیچ شتێکی نەوێت تەنها ئەوە نەبێت کە خوا لێی ڕازییە و خوا خۆشی دەوێت، ئەمەش لە دوو شت بەدەر نیە، یان ئەو شتە واجب کراوە لەسەری یان سوننەتە.

بۆیە هەموو ئەو شتانەی خۆش دەوێت کە خوا خۆشی دەوێت و هەموو ئەو شتانەی ڕق لێیە کە خوا خۆشی ناوێت، ئەمە مانای ئەم ئایەتەیە کە خوا دەفەرمووێت: ﴿إِلاَّ مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ واتە: (مەگەر کەسێک بە دڵ و دەروونی پاک و بێگەرد و پڕ لە ئیمان، بە خزمەت پەروەردگار گەیشتبێت). [الشعراء: ٨٩]. ئەمە مانای دڵی ساغە، ئەو دڵەیە کە سەلامەتە لە غەیری خوا و تەنها خوای تێدایە، هەموو شتێکی لەبەر خوایە لە خۆشەویستی و ڕق و کردن و وازهێنان!

تەنها دڵێک عیبادەتی خوا دەکات، سەلامەتە. لە عیبادەتکردن بۆ غەیری خوا، دڵێکە ئەوەی دەوێت کە خوا دەیەوێت، دڵێکە خۆشەویستی جگە لە خوای تێدا نییە، ئەم ناوەڕۆکە هەمووی یەك مانایە لەگەڵ (فەنابوون) جا ناوی دەنێیت

(فەنابوون) یان شتێکی تر کێشە نییە، چونکە عیبرەت بە ناو نییە، بەڵکوو بە مانا و ناوەڕۆکە ئەمە سەرەتا و کۆتاییی ئیسلامە، ناوەوە و ڕواڵەتی دینە! [دڵ پەیوەست بێت بە خوا و بتوێتەوە لەناو گوێڕایەڵیی فەرمانی خوا و شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەی ئەوە دڵێکە بۆ خوا، جا ناوی دەنێیت فەنابوون یان دڵێک بۆ خوا یان شتێکی تر، ئاساییە، چونکە ناو گرنگ نییە، بەڵکوو حیساب و پێوانە و سەنگی مەحەک، ناوەڕۆکە.]

جۆری دووەم: جۆری دووەم لە (فەنا) ئەوەیە تەنها خوا دەبینێت و بە ئاگایە بە خوا و غافڵ نییە، تەنها خوای بە لاوە گرنگە و دڵی تەنها ئەوی تێدایە. ئەمە زیاتر ئەوانە بە دەستی دەهێنن کە ڕێگەی خوایان گرتووە، چونکە دڵیان پەیوەستە بە خۆشەویستیی خوا و یادی خوا، ئەوان هەمیشە دڵیان کێش دەکرێت و ڕادەکێشرێت بە خۆشەویستی و زیکری خوا. بۆیە هەمیشە ئاگان بە خوا و یادی خوا و خۆشەویستیی خوا. خوا لە دڵی ڕێبوارانی ڕێگەی خوا مەبەستی سەرەکی و ئامانجی سەرەکییە، هەرگیز شتێکیان بە دڵدا نایەت لە غەیری خوا، ئەمانە هەست ناکەن بە غەیری خوا، بەڵکوو تەنها ئاگان بە خوا. هەروەکوو دەربارەی ئەم ئایەتە وتراوە ﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَى فَارِغًا إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِ لَوْلَا أَن رَّبَطْنَا عَلَى قَلْبِهَا﴾ واتە: (ئەوسا دایکی موسا هەستی بە بێتاقەتی و بە بۆشاییەکی زۆر دەکرد لە دڵ و دەروونی خۆیدا، بە ڕاستی خەریک بوو ڕازەکە ئاشکرا بکات، ئەگەر ئێمە دڵیمان دامەزراو نەکردبایە). [القصص: ١٠].

وتراوە: دڵی دایکی موسا خاڵی بووە لە هەموو شتێك تەنها موسای تێدا بووە!

زۆر جار ئەم شتانە تووشی مرۆڤ دەبێت تەنها ترسێکی تێدایە، یان خۆشەویستییەکی تێدایە و دڵی داگیر کراوە، جاری وا هەیە دڵ پڕ دەبێت لە ڕەجای شتێك، کە دڵ پڕبوو بە شتێك، ئەوا پشت دەکات لە هەموو ئەو شتانەی تر کە غەیری ئەوە نەبێت کە لە دڵی دایە و دڵی داپۆشیوە! جا ئەم شتە ترس بێت یان ئومێد یان خۆشەویستی. ئەم دڵە ڕۆ دەچێت لە خۆشەویستیی ئەم شتە، یان ئەم ترسە وا دەزانێت تەنها ئەو شتە بوونی هەیە، چونکە دڵی پڕ بووە لەم شتە.

دڵ کە بە خۆشەویستیی کەسێک یان ئومێدبوون بە کەسێک یان ترس لە کەسێک ئەوا هەموو ئەو شتانەی پێچەوانەی ترس و خۆشەویستی و ئومێدن، فڕێی دەداتە دەرەوە، چونکە دوو دژ بە یەکەوە کۆ نابنەوە. ئەو دڵەی پەیوەستە بە خوا و تەنها خوای تێدایە، هەموو ئەو شتانەی پێچەوانەی خۆشەویستیی خوان، لە دڵدا فڕێیان دەداتە دەرەوە، چونکە هیچ جێگەیەکی دیکە نەماوە لە دڵدا بۆ شتێکی تر جگە لە خوا.

جا کاتێك ئەم فەنائە بەهێز دەبێت و لە مرۆڤدا قووڵ دەبێتەوە، ئەوا بێئاگا دەبێت و خۆیشی لە یاد دەکات، تەنها سەرنجی لەسەر ئەوە خۆی لە بیر دەباتەوە، یادی دەکات، دەیپەرستێت، خۆشی دەوێت! زیاتر دەیناسێت و جار لە دوای جار خۆی لە یاد دەچێت و تەنها ئەو دەبینێت و مەبەستی سەرەکی دڵیەتی.

ئەم مرۆڤە وای لێ دێت مەخلوقات لە دڵیدا فەنا دەبێت و نامێنێتەوە، لەناو دڵیدا تەنها خوا هەیە تەنها ئەوە دەمێنێتەوە و (فەنا) نابێت، تەنها ئەو دەمێنێتەوە کە هەر هەبووە و هەر دەمێنێت، ئەویش پەروەردگاری جیهانییانە. کەواتە ئەم جۆری فەنابوونە، فەنابوونی عەبدە لەناو یاد و زیکری خوا و لە یادکردنی مەخلوقاتە. [ئەم جۆرە فەنابوونە تا ئێرە فەنابوونێکی باشە و مەدح کراوە].

ئەگەر ئەمە بەهێز بوو، ئەوا خۆشەویستی لاواز دەبێت و تێکەڵیی بۆ دروست دەبێت، ناتوانێت شتەکان لە یەکتر جیا بکاتەوە، خۆشەویستەکەی لێ دەبێت بە خۆی! وا گومان دەبات کە ئەو خۆی خۆشەویستەکەیەتی! وا دەزانێت وەکوو یەکن و یەک شتن. وەکوو دەگێڕنەوە پیاوێك خۆی خستە ناو ئاوێك و خۆشەویستەکەشی بە دوای ئەودا خۆی دەخاتە ناو ئاو! دەڵێت: باشە من خۆم خستە ناو ئاو، بەڵام تۆ بۆچی بە دوای مندا خۆت خستە ناوی؟ گوتی: من کە تۆم بینی، بێئاگا بووم لەوەی کە بزانم خۆم خۆم بم، بەڵکوو وامزانی تۆش هەر منی!

لەم بابەتەدا زۆر کەس هەڵخەڵەتاوە و تووشی پێ هەڵخلیسکان بووە وایانزانیوە ئەگەر مرۆڤ وا بێت، ئەوا گەیشتووە بە خوا و خواش بووە بەو و ئەویش بووە بە خوا! جا ئەمە ئەو جۆرە فەنائە مەترسیدارەیە کە هەندێک خەڵکێك باسی لێوە

دەکات و بانگەشەی بۆ دەکات. چونکە فەنابوون بەم مانایەی مرۆڤ تەنها خوای لە یاد بێت و تەنها مەبەستی ڕازیکردنی خوا بێت و دڵی یەک پارچە بێت لە خۆشەویستیی خوا و پشتبەستن بە خوا و یادی خوا، ئەوا فەنابوونێکی باش و بە چاک باس کراوە. بەڵام بەم مانایەی مرۆڤ بگاتە قۆناغی تێکەڵبوون لەگەڵ خوا و یەکبوونەوە لەگەڵ خوا، ئەمەیان مەترسیدارە و شەرع و ئەقڵ دژی ئەم جۆرە فەنابوونەن.

بۆیە خوا و غەیری خوا دوو شتی جیان، هیچ شتێك لەگەڵ خوا یەک ناگرێت و نابێتەوە یەك! هەر کاتێك دوو شتی جیاواز تێکەڵ بوون، ئەوا بنچینەی بوونی هەر یەکێکیان تێک دەچێت و شتێکی سێیەم دروست دەکەن و پێك دەهێنن! بۆ نموونە ئەگەر ئاو و شیر لەگەڵ یەکتر یەک بگرن یان لەگەڵ ئاو و عەرەق، ئەوا نە ئاوەکە ئاو دەمێنێتەوە نە شیرەکە و عەرەقەکەش وەکوو خۆی دەمێنێتەوە! بۆیە ئەم باوەڕە باوەڕێکی هەڵەیە ئەگەر عەبد تێکەڵ ببێت لەگەڵ خوا و ببێتەوە یەک شت، پەنا بە خوا. بەڵام ئیرادەی خوا و ئیرادەی عەبد یەک دەگرێت و تێکەڵ دەبێت، بۆ نموونە خوا شتێکی خۆش دەوێت و لێی ڕازییە، عەبد ئەو شتەی خۆش دەوێت کە خوا خۆشی دەوێت و لێی ڕازییە، لێرەدا ئەم دوو ویستە تێکەڵ دەبن و دەبنە یەك شت، عەبد ئەوەی خۆش دەوێت کە خوا خۆشی دەوێت! خوا ڕقی لە شتێکە عەبدیش ڕقی لەو شتە دەبێتەوە کە خوا ڕقی لێیەتی و پێی ڕازی نییە.

بۆیە لە ئیرادەی خۆشویستنی شتێك و ئیرادەی ڕقبوونەوە لە شتێک خوا و عەبد هاوویست دەبن، کە عەبد ئەوەی خۆش دەوێت کە خوا خۆشی دەوێت، ئەوەشی ڕق لێیە کە خوا ڕقی لێیە، نەك لە بنچینەی بوونیان یەک بگرن! ئەمە باوەڕێکی هەڵەیە خەڵکانێك تێی کەوتوون. کەوابوو ئەم جۆرە فەنائە، فەنائێکی کەموکورتە!

گەورەخۆشەویستانی خوا لە ئەبو بەکر و عومەر و موهاجیر و ئەنسار، هیچ یەکێک نەکەوتوونەتە ناو ئەو جۆرە فەنائە، جا ئەوانە نەکەوتبنە ناو ئەو جۆرە

فەنائە، ئەوا ئەولاترە کە پێغەمبەران هەرگیز نەکەوتوونەتە ناو ئەم جۆرە فەنائە، بەڵکوو ئەم جۆرەیان لە دوای چینی هاوەڵان سەری هەڵدا و پەیدا بوو.

هاوەڵان زۆر دامەزراوتر و ژیرتربوون لەوەی بکەونە ناو ئەم جۆرە فانابوونە، هاوەڵان شێت نەبوون و شتیان تێکەڵ نەکردووە، هاوەڵان زۆر لەوە بەهێزتربوون کە ئەقڵیان نەمێنێت و بانگەشەی ئەم جۆرە لە فەنابوونە بکەن.

بۆیە بنەمای ئەم جۆرە فەنابوونە لە چینی تابیعین دروست بوو، بە تایبەت لە لای هەندێک خواپەرستانی بەسرە، کاتێك گوێیان لە قورئان دەگرت دەمردن یان لە هۆش خۆیان دەچوون. وەکوو (جُهَيرِ الضّرير) و (وزُرَةَ بنِ أَوْفى) و (قاضي البصرةِ). هەندێك لە گەورەسۆفییەکان تووشی ئەم حاڵەتە بوونە وەکوو لاوازیی جیاکردنەوە و بوورانەوە و فەنابوون، بەڵام کاتێك بە هۆش خۆیان دەهاتنەوە دەیانزانی کەوتوونەتە ناو هەڵە و لێی پەشیمان دەبوونەوە، وەکوو (أبي يزيدَ) و (أبي الحُسَين النُّوري) و (أبي الشِّبْلي) نموونەی ئەمانەش. پێچەوانەی ئەمانە کە هەمیشە ئاگایان لە خۆیان بووە و هەرگیز جیاوازیەکانیان تێکەڵ نەدەکرد، ئەوانە بوون: (أبي سُلَيمَانَ الدَّارَانيِّ) و (مَعْروفٍ الكَرْخِيِّ) و (الفُضَيلِ بن عِياضٍ). نموونەی ئەوانەش.

ئەوانەی بەندەی ڕاستی پەروەردگار بوون جگە لە خۆشەویستیی خوا هیچ خۆشەویستییەکی تر لە دڵیاندا نەبوو، زانستیان هێندە فراوان بووە نەکەوتوونەتە ناو ئەم جۆرە فەنائە، بەڵکوو شتەکانیان وەکوو خۆی بینیوە و جیاوازیەکانیان تێکەڵ نەکردووە.

ئەوانە وای دەبینن کە هەموو دروستکراوەکان لەژێر دەسەڵاتی پەروەردگاردایە و بە ئەمر و ویستی خوا بەڕێوە دەچن، ئەوانە ملکەچی خوان و فەرمانەکانی خوا جێبەجێ دەکەن، هەموو مەخلوقات بۆ ئەوان بەرچاوڕوونیی تێدایە و ئایەتی خوای پەروەردگارن، ئەمە زیاتر بەهێزیان دەکات لەسەر دڵسۆزی و نیەتپاکی، ئەم بەرچاوڕوونییەی کە هەیانە وایان لێ دەکات درێژە بە ڕێگەکەیان بدەن و، بەردەوام دڵیان دادەمەزرێت لەسەر بەندایەتی بۆ خوا. بە تاك و تەنها خوا دەپەرستن

و هاوەڵی بۆ بڕیار نادەن، ئەمەش حەقیقەتێکە قورئان بانگەوازی بۆ کردووە و، ئەهلی جێبەجێکارانی ئیمان و تەقوا ئەمەیان کردووە لە پێغەمبەران کە پێشەوان و و هاوەڵان و پیاوچاکان.

کاتێك پێغەمبەری خوا بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان گفتوگۆی لەگەڵ خوا کرد، وەکو خۆی مایەوە و تێک نە چوو، بە پێچەوانەی موسا کە لە هۆش خۆی چوو بە هۆی بینینی لەتوپەتبوونی شاخ بە هۆی دەرکەوتنی گەورەیی خوا!!

جۆری سێیەم: جۆری سێیەم لە (فەناء) بۆ دووڕوو و مولحید و گومڕاکانە، کە باوەڕیان وایە هیچ بوونێك نییە تەنها خوا نەبێت و، بوونی خوا بوونی دروستکراوەکانە، هیچ جیاوازییەک نییە لەنێوان خوا و بەندە و مەخلوقاتدا، ئەم جۆرە فەنائە، فەنائی گومڕا و دووڕوو لە ڕێگەدەرچووانە! کە باوەڕیان وایە خوا و جیهان یەك شتن!

ئەوانەی لەسەر ڕێگەی ڕاستن لە شەیخەکان و پیاوچاکان و زانایان پشت دەکەن لەم جۆرە فەنابوونە و پێچەوانەی ئەم جۆرەن. دڵ کە پەیوەست بوو بە خوا و تەنها خۆشەویستیی خوای تێدا بوو و بە تەنها پەرستی و ئەوی تێدا بوو و بەتاڵ بوو لە غەیری خوا، ئەوا هیچ نابیستێت و مەبەستی نییە تەنها خوا نەبێت، لە هیچ ناترسێت تەنها خوا نەبێت ئومێدی بە هیچ نییە تەنها خوا نەبێت، دڵی خاڵی دەبێت لە پەیوەستبوون بە دروستکراوەکان، سەیری هیچ ناکات، ئیللا بە نووری خوا نەبێت!! بۆیە تەنها حەق دەبیستێت، تەنها حەق دەبینێت، ئەندامەکانی لە حەقدا بەکار دەهێنێت، لەبەر خوا دەڕوات و لەبەر خوا دەگەڕێتەوە لە شتێک و، لەبەر خوا دەڵێت و لەبەر خوا بێدەنگ دەبێت و، تەنها مەیلی ئەوە دەکات کە خوا خۆشی دەوێت و خوا لێی ڕازییە، تەنها ئەو شتانەی خۆش دەوێت کە خوا خۆشی دەوێت. مەخلوقات دەبینێت، بەڵام دڵی هەر لای خوایە و پەیوەستە بە خوا، بینینی دروستکراوەکان تەنها بینینێکی ڕوونە بێ پەیوەستبوون و دڵپێوەلکانی! لەبەر خوا ڕقی دەبێتەوە و لەبەر خوا خۆشەویستیی بۆ شت هەیە، دوژمنی ئەو شتەیە کە دوژمنی خوایە و خوا خۆشی ناوێت. تەنها لە خوا دەترسێت، لە غەیری خوا

ناترسێت، ئا ئەوە دڵی ساغە، ئەوە ئەو دڵە ساغەیە کە تەوحیدی تێدایە، دڵی پێغەمبەران و خواناسان و ئیماندارانە.

بۆیە جۆری سێیەم لە فەنابوون، هاوشێوەی فەنابوونی فیرعەون و ئالی فیرعەونە. بەڵام ئەو جۆرە فەنائەی کە پێغەمبەران و پیاوچاکان لەسەری بوون جۆرێکی ستایشکراوە و ئەم جۆری سێیەمە نییە لە فەنائی فیرعەون و ئالی فیرعەون. ئەوانەی دەڵێن: من هیچ نابینم لە دروستکراوەکان تەنها خوا نەبێت و خوا و بوونی دروستکراوەکان جیا ناکاتەوە، ئەوا کەسێك ئەمە دەڵێت: کە ئەقڵی تەواو نەبێت، یان بیروباوەڕی ناتەواو و خراپ بێت، بۆیە ئەم کەسە هەمیشە لەنێوان شێتی و ئیلحاددایە.

هەموو زانا و پیاوچاك و خۆشەویستانی خوا لەسەر ئەوە کۆکن کە خوا و مەخلوقات جیاوازن لە یەکتری، لە دروستکراوەکانیش هیچ شتێك نییە لە زاتی خوا بێت، خوا جیاوازە لە مەخلوقات، لە زاتی خواشدا هیچ مەخلوقاتێك نییە، بۆیە واجبە جیاکردنەوەی خالق و مەخلوق، جیاکردنەوەی خوای هەر بوو و خوای دروستکراوەکان کە پێشتر نەبوون!

ئەوانەی گوتیان: بینینی دروستکراوەکان بینینی خوایە و خوا و مەخلوقاتیان جیا نەکردەوە، ئەوا کەوتنە ناو هەڵەیەکی زۆر گەورە، چونکە خوا و دروستکراوەکانی خوایان کردە یەك شت. بۆیە کاتێك بەندە سەیری مەخلوقات دەکات زیاتر دڵی دادەمەزرێت و دڵی زیاتر پەیوەست دەبێت بە خوا، چونکە مەخلوقات نیشانە و دەرخەری گەورەیی پەروەردگارن، نەك خودی خوا بن، پەنا بە خوا. بە سەیرکردن و تێڕامان لە بوونەوەر و بەندە زیاتر خوای خۆش دەوێت یان لێی دەترسێت یان ئومێدی پێی دەبێت، تەنها دڵی پەیوەست دەبێت بە خوای جیهانییان و جگە لەو هیچ کەسێکی تر ناپەرستێت و تەنها عیبادەت بۆ ئەو دەکات. بۆیە ئەگەر بەندە جیاوازیی کرد لەنێوان خالق و مەخلوق، ئەوا دڵی کۆ دەبێتەوە لەسەر حەق و بە تەنها خوا دەپەرستێت و تەنها داوا لە خوا دەکات و ترس و ئومێدی تەنها بە خوا دەبێت. ئەمە ڕاستترین جۆری فەنابوونە!

واجبە دڵ زانستی بەوە هەبێت خوا بناسێت و خۆشی بوێت و بیپەرستێت بە تاك و تەنها و خوا و مەخلۆقات تێکەڵ نەکات، ئەمەش مانای ڕاستەقینەی (لَآ إِلَـهَ إِلَّا اَللَّــه)ـیە کە هەموو ئەو شتانە لە دڵدا دەخاتە دەرەوە کە پێچەوانەی بەندایەتیکردنی خوای پەروەردگار و تەوحیدی پەروەردگارە. دڵی پاك دەکاتەوە لە هەموو پەرستنێك لە غەیری خوا، ئەندامەکانیش دەبنە شوێنکەوتەی ئەو دڵە ساغە و ئەوە جێبەجێ دەکەن کە لە دڵدا چەسپاوە و جێگیر بووە! بۆیە ئەم بەندەیە هۆشیاری و ئاگاییی بۆ دروست دەبێت هەم لە زانست و هەم لە ویستیدا. هەم دەزانێت خوا و مەخلوق جیاوازن، هەم ئیرادە و ویستی لەسەر دوورکەوتنەوە لە غەیری خوایە، مەبەستیەتی تەنها خوا لە خۆی ڕازی بکات بە زانست و بە ئیرادەی دڵی بەو شێوەیەی کە پێغەمبەران پێی هاتن و پێچەوانەی شەریعەت نییە. کە خوای ناسی و جیای کردەوە لە مەخلوقات، ئەوا خوای خۆش دەوێت و بەندایەتی دەکات بە تاك و تەنهایی، تەنها لەویش دەترسێت و پشت تەنها هەر بەو دەبەستێت و ڕقلێبوون و خۆشەویستی تەنها لەبەر زاتی اللەیە. خۆی دوور دەگرێت کە دڵی پەیوەست بێت لە غەیری خوا و ترس لە غەیری خوا و داوای تکا لە غەیری خوا، خۆی دوور دەگرێت لە هەر شتێك کە پێچەوانەی تەوحیدی ڕاستەقینەیە. [پێچەوانەی هەر سێ جۆری تەوحیدە کە بریتین لە:

## یەکەم: توحید الربوبیة:

بریتییە لە بە تاکدانانی خوا بە کارەکانی، بەوەی کە بەندە بڕوای وا بێت بە تەنها اللە بەدیهێنەری هەموو مەخلوقاتە، ڕۆزیدەریانە، خاوەنیانە، بەڕێوەبەری تەواوی کاروبارەکانیانە، شەو و ڕۆژ ئاڵوگۆڕ دەکات و بەسەر یەکتردا دەیانهێنێت، زیندوو دەکاتەوە و دەمرێنێت، بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا.

## دووەم: توحید الألوهیة:

بریتییە لە بە تاکدانانی خوای گەورە لە پەرستن و عیبادەتەکاندا وەکو دوعا و نەزر و سەربڕین و ئومێدخواستن و پشتپێبەستن و هاوشێوەکانی کە زانایان باسیان کردووە.

ئەم جۆرەش لە جۆرەکانی تەوحید، بریتییە لە کڕۆکی بانگەوازی هەموو پێغەمبەران، چونکە ئەوە بنچینەیە و کردەوەکانی تری لەسەر بونیاد دەنرێت، بەبێ پەیڕەو و پیادەکردنی ئەم جۆرە تەوحیدە کردەوەکان ڕاست و ڕاساڵ نابن، بەڵکوو دژەکەی دێتەکایەوە، کە ئەویش شیرك و هاوبەشبڕیاردانە بۆ خوا.

## سێیەم: توحید الأسماء والصفات:

بریتییە لە باوەڕبوونێکی تەواو بەوەی کە خوای گەورە چەند ناوێکی باش و جوان و سیفاتگەلێکی بەرز و تەواوی هەیە، کە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ هاتوون، ئەو زاتەش هەموو سیفاتێکی تەواوی هەیە و پاك و بێگەردە لە هەموو سیفاتێکی ناتەواو و کەموکورت و تاك و جیاوازیشە بەوە لە هەموو دروستکراوەکان. (وەرگێڕ)].

بۆیە زیکری (لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا ٱللَّـٰهُ) زیاتر ئەم جۆرە فەنابوونە ڕوون دەکاتەوە و لە گەورەترین و بەرزترین زیکرەکانە. پێغەمبەری خودا دەفەرموویێت: (أَفْضَلُ الذِّكْرِ: لَا إِلَهَ إِلاَّ الله) واتە: چاکترین و بڵندترین زیکر وتنی: (لَا إِلَهَ إِلاَّ الله)یە. [1]

جا ئەوانەی دەڵێن: ئەم زیکرە زیکری عامەی خەڵکییە و زیکری تایبەت گوتنی (الله، الله)ـیە و، زیکری تایبەتی تایبەت گوتنی (هو، هو، هو)ـە، ئەمانە لە گومڕاییدان.

---

(١) الترمذي (٤٦٢/٥) برقم (٣٣٨٣)، وابن ماجه (١٢٤٩/٢).

بەڵگە دەهێننەوە بەوەی کە خوای پەروەردگار لەم ئایەتەدا ﴿قُلِ اللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ﴾ واتە: (پێیان بڵێ: هەر خوا خۆی دایبەزاندووە و فێریشی کردوون، لەمەودوا وازیان لێ بێنە با لە بەتاڵ و نادروستی خۆیاندا ڕۆ بچن و گەمە و یاری بکەن!!). [الأنعام: ٩١].

فەرموویەتی: ﴿قُلِ اللَّهُ﴾ کەواتە ئەمە بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە دروستە یادی خوا بە (الله، الله) بکرێت، بەڵام لەمەدا بە هەڵەدا چوون، چونکە ئەم ئایەتە وەڵامی پرسیارێکە، (پێش باسکردنی: ﴿قُلِ اللَّهُ﴾ ئایەتەکە دەفەرموێت: ﴿قل من أنزل الكتاب الذی جاء به موسى ..﴾ واتە: بڵێ کێ ئەو کتێبەی دابەزاندووە کە موسا پێ هاتووە یان هێناویەتی؟ لە وەڵامدا بڵێ: (قل الله) واتە: بڵێ خوای گەورە. [قرطبی ڕەحمەتی خوای لێ بێت، دەفەرموێت: ﴿قُلِ اللَّهُ﴾ واتە:

١. ئەی محمد، الله ئەو کتێبەی دابەزاندووە بۆ موسا و و ئەم کتێبەش کە بۆ من هاتووە.

٢. یان خوای گەورە ئێوەی فێرە کتێب کردووە. (وەرگێڕ)]

کەوابوو ئەمە هەڵەیە، چونکە ﴿قُلِ اللَّهُ﴾ ماناکەی ئەوەیە کە الله ئەو کتێبەی بۆ موسا دابەزاندووە کە پێی هاتووە، ﴿قُلِ اللَّهُ﴾ واتە: بڵێ الله وەڵامە بۆ ﴿قل من أنزل الكتاب الذی جاء به موسى ..﴾

کەوابوو وتنی (الله، الله) و (هو، هو، هو) قسەی تەواو نین، ڕستەی بەسوود نین و، پەیوەست نین بە ئیمان و کوفر و ئەمر و نەهی. ئەمە نە لە قورئان و نە لە سونەت و نە لە هاوەڵان و سێ سەدەی زێڕینی پێشینان جێگیر نەبووە، بەڵکوو هەندێک لە سۆفییە گومڕاکان ئەمەیان داهێناوە.

هەندێک لە شەیخەکانیان دەڵێن ئێمە دەترسین بڵێین (لَآ إِلَـهَ إِلاَّ اللـه)، چونکە دەترسین بمرین لەنێوان (النفي و الاثبات)، [واتە: دەترسن بڵێن (لَآ إِلَـهَ) بمرین و بە (إِلاَّ الله) ڕانەگەین! بۆیە دەڵێین (الله، الله) یان (هو، هو)].

ئەمەش گومڕاییەکی دیکەیە تێی کەوتوون و پێچەوانەی شەریعەتە، چونکە نازانن ئەوەی مەبەستی بێت بڵێت (لَآ إِلَـهَ إِلاَّ اللـه) بەڵام نەگات بە (إِلاَّ اللـه) لەسەر ئەو حاڵە دەمرێت کە گوتوویەتی (لَآ إِلَهَ إِلاَّ الله).

لە پێغەمبەری خودا جێگیر بووە کە خەڵکیی پێش سەرەمەرگ تەڵقین داوە بە وتنی (لَآ إِلَهَ إِلاَّ الله) (١)

فەرموویەتی: (من كان آخرُ كلامهِ لا إلهَ إلَّا اللهُ دخل الجنَّةَ) (٢)

ئەگەر ئەوە ڕاست بووایە کە ئەوان باسی دەکەن ئەمە و نموونەی ئەم فەرموودانە (لقِّنوا مَوْتاكم لا إلهَ إلَّا اللهُ، فإنَّ مَن كان آخرَ كلمتِه لا إلهَ إلَّا اللهُ عندَ المَوتِ، دخَلَ الجنَّةَ يومًا مِن الدَّهرِ، وإنْ أصابَه قبلَ ذلك ما أصابَه) لە پێغەمبەری خودا جێگیر نەدەبوون!

کەوابوو زیکری خوا بە (الله، الله) و (هو، هو) و (یا هو، یا هو) زۆر دوورە لە سوننەت، بەڵکوو بیدعە و گومڕاییە.

خوای پەروەردگار ئەمری نەکردووە یادی بکەین بە ئیسمی موفرەد (الله، الله، هو، هو، یا هو، یا هو) ئەمە هیچ سوودێکیش بە ئیمان ناگەیەنێت، بە کۆڕای ئەهلی ئیسلام. ئەمریش نەکراوە بەم جۆرە زیکرە. ئەم جۆرە ئایەتانە و هاوشێوەی ئەمانە، ئەوە لەخۆ ناگرن کە یادی خوا بکرێت بە ئیسمی موفرەد و بە (الله، الله)کردن و (هو، هو)کردن.

---

(١) رواه ملسم ٩١٧.
(٢) أخرجه أبو داود (٣١١٦).

نموونەی ئەم ئایەتانە ﴿وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلا﴾ واتە: (تۆ هەمیشە با ناوی پەروەردگارت ویردی سەر زارت بێت، بە دڵسۆزی و ملکچییەوە ڕووی تێ بکە). [المزمل: ٨].

﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى﴾ واتە: (تەسبیحات و ستایشی پەروەردگاری بەرز و بڵند و پایەدارت بکە). [الأعلى: ١].

﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّى * وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّى﴾ واتە: (بێگومان ئەو کەسە سەرفرازە کە دەروونی خۆی پاک ڕاگرتووە و * ناوی پەروەردگاری دەبات و نوێژی بۆ دەکات و کڕنووش و سوجدەی بۆ بردووە). [الأعلى: ١٤-١٥].

﴿فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ﴾ واتە: (جا کەواتە ستایش و سوپاسگوزاری پەروەردگاری گەورە بە و با ناوی پیرۆزی هەمیشە لەسەر زارت بێت). [الواقعة: ٧٤].

ئەم ئایەتانە و وێنەی ئەمانەش یاد و زیکری خوا بە موفرەد لەخۆ ناگرن (الله، الله، هو، هو، یا هو، یا هو) بەڵکوو لە سوننەتدا هاتووە کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی ﴿فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ﴾ واتە: (جا کەواتە ستایش و سوپاسگوزاری پەروەردگاری گەورەبە و با ناوی پیرۆزی هەمیشە لەسەر زارت بێت). [الواقعة: ٧٤]. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (لە ڕکوعدا ئەمە بڵێن). کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى﴾ واتە: (تەسبیحات و ستایشی پەروەردگاری بەرز و بڵند و پایەدارت بکە). [الأعلى: ١]. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (لە سوجدەدا ئەمە بڵێن).

شەرع دایناوە کە لە ڕکوعدا بڵێن: (سبحان ربي العظيم) و لە سوجدەدا بڵێن: (سبحان ربي الاعلى).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (كَلِمَتَانِ حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ)[١] واتە: (دوو كەلیمە هەن خۆشەویستن لای "الرحمن" و سووكن لە سەر زمان و قورسن لە سەر تەرازوو، ئەویش "سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ"). پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (أَفْضَلُ الذِّكْرِ: لَا إِلَهَ إِلاَّ الله) واتە: (چاكترین و بڵندترین زیكر وتنی: (لَا إِلَهَ إِلاَّ الله)یە).

لە (سُنَن ابن ماجە) هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (أَفْضَلُ الذِّكْرِ: لَا إِلَهَ إِلاَّ الله، وَأَفْضَلُ الدُّعاء: الحمدُ لله). لە (البخاري ومسلم)دا هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (مَنْ قال في يومه مائةَ مَرَّةَ: لا إِلَهَ إِلَّا الله، وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير، كَتَبَ اللهُ له حِرْزًا مِنَ الشَّطان يومَه ذلك، حتى يُمْسي، ولم يَأتِ أَحَدٌ بأفضلَ مِمَّا جاءَ به، إلا رجلٌ قالَ مِثْلَ ما قال أَو زاد عليه، ومَنْ قال في يومه مائةَ مرَّة: سُبْحَانَ اللَّه وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ، حُطَّت عنه خطاياه ولو كانت مثلَ زَبَدِ البَحْرِ).

وێنەی ئەم فەرموودانە زۆرە دەربارەی زیكر و دوعا، ئەوەشی لە قورئاندا هاتووە دەربارەی ئەوەی كە خوا لە قورئاندا دەفەرمووێت: ﴿وَلاَ تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ﴾ واتە: (لەو ئاژەڵە سەربڕاوانەش مەخۆن كە ناوی خوا لە كاتی سەربڕینیاندا نەبراوە). [الأنعام: ١٢١].

دەفەرمووێت: ﴿فَكُلُواْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَاذْكُرُواْ اسْمَ اللَّهِ﴾ واتە: (دە بخۆن لەوەی بۆتان دەگرن و ناوی خوای لێ بهێنن كاتێك بەرەڵای دەكەن و كاتێك لێی دەخۆن). [المائدة: ٤].

---

(١) متفق عليه .

کاتێک خوا دەفەرمووێت: (بسم الله) ئەوە ڕستەیەکی تەواوە و بەسوودە تەنها مەبەستی پێ ناوی الله نییە وەکو وشە، بەڵکوو مەبەست پێی دەستپێکردنە بە ناوی الله. (بسم الله) ئەمە ڕستەیەکی ئیسمییە یان فیعلییە، دیارترین ڕای نەحوییەکان ئەوەیە کە جوملەیەکی ئیسمییە تەقدیرەکە (ذَبْحِي بسمِ اللهِ)ـیە بە فیعل (أذبحُ بسمِ الله).

هەروەها وەکوو (بسمِ الله الرحمان الرحيم) بە تەقدیری (قراءَتي بسمِ اللهِ). یان (أقرأُ بسمِ اللهِ).

هەندێك خەڵك دەڵێن: دەستپێکردنم بە ناوی خوایە یان بە فعل دەڵێن: (دەستم پێ کرد بە ناوی خوا) بۆیە بە تەقدیری ئیسم تەواوترە، (قراءَتي بسمِ اللهِ). چونکە جوملەی ئیسمی بەڵگەیە لەسەر جێگیری و بەردەوامی، بەڵام ڕستەی کرداری بەڵگە نییە لەسەر جێگیری و بەردەوامیی دەستپێکردن بە ناوی خوا، بەڵکوو دەبێت نوێ بکرێتەوە.

هەروەکوو لێرە دەرکەوتووە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ واتە: (ئەی محمد بخوێنە بە ناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە). [العلق: ١].

لەم ئایەتەدا ﴿بِسْمِ اللَّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا﴾ واتە: (بە ناوی خواوەیە ڕۆیشتنی و وەستاندنی). [هود: ٤١]. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (من كان ذبح قبل أن يصلي فليذبح مكانها أخرى، ومن كان لم يذبح فليذبح بسم الله.)[1] واتا: ئەوەی پێش نوێژی جەژن بیکات، قوربانیی داوە، با دانەیەکی تر بکات بە قوربانی لە شوێنیدا، هەر کەسێکیش قوربانیی نەکردووە، با قوربانییەکەی بکات و ناوی خوای لێ بێنێت.

(١) البخاري (١٠/١٧).

هەروەها پێغەمبەری خوا بە (عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە) دەڵێت: (يا غُلامُ، سمِّ آلله، وكُلْ بِيَمِينِك، وكُلْ ممَّا يَلِيكَ) واتە: (ئەی کوڕ "ئەی غولام"، (بسم الله) بکە و، بە دەستی ڕاست و لە پێشی خۆتەوە بخۆ).

کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ دەڵێت: ناوی خوا بهێنە (بسم الله) مەبەست ئەوە نییە تەنها بڵێ: (الله). هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ بە (عەدی کوڕی حاتەم) دەڵێت: (إذا أرسلتَ كلبَكَ المعلَّمَ، وذكرتَ اسمَ الله، فكُلْ) واتە: (ئەگەر سەگە فێرکراوەکەتت بەڕەڵا کرد و ناوی خودات هێنا، ئەوا هەر شتێکی بۆت گرت، بیخۆ). (١)

هەروەها دەفەرمووێت: (إذا دخل الرجل بيته فذكر الله تعالى عند دخوله وعند طعامه قال الشيطان لأصحابه لا مبيت لكم ولا عشاء). واتە: (ئەگەر پیاو بچێتە ماڵەوە، ناوی خودا بهێنێت لە کاتی چوونە ژوورەوەی و لە کاتی خواردنی، ئەوا شەیتان بە هاوڕێکانی دەڵێت: ئیمڕۆ هیچ شوێنێکی خەوتن و هیچ خواردنێکتان بۆ نییە، ئەگەر بچێتە ژوورەوە و ناوی خودا نەهێنێت، شەیتان دەڵێت: شوێنی خەوتن و خواردنتان بۆ هەیە). (٢)

وێنەی ئەم فەرموودانە زۆرە. هەروەها ئەو شتانەی بۆ موسڵمانان تەشریع کراوە لە نوێژ و بانگ و جەژنەکان و حەج، هەمووی بە ڕستەی تەواو و بەسوود تەشریع کراوە نەک تەنها بە ئیسمێکی موفرەد.

وەکوو بانگبێژ دەڵێت: (الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، أشهد أن لا إله إلا الله، أشهد أن لا إله إلا الله، أشهد أن محمدًا رسول الله، أشهد أن محمدًا

(١) رواه البخاري (٩/٦٠٩) ومسلم (١٩٢٩).
(٢) رواه مسلم: (٢٠١٨).

رسول الله، حَيَّ على الصلاة، حَيَّ على الصلاة، حَيَّ على الفلاح، حَيَّ على الفلاح، الله أكبر، الله أكبر، لا إله إلا الله). [١]

نوێژخوێن دەڵێت: (الله أكبر، سبحان ربي العظيم، سبحان ربي الاعلى، سمع الله لمن حمده، ربنا ولك الحمد، التحيات لله).

ئەوانەی تەلبیاتی حەج دەکەن دەڵێن: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ، وَالنِّعْمَةَ، لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ).

وێنەی ئەمانەش کە خوا داینـاوە بە زیکـر، قسەیەکی تەواو و مانادار و بەسوودە، نە ناوێکی تاکی ئاشکرایە وەکوو (الله، الله، الله) نە ناوێکی تاکی نادیارە وەکوو (هو، هو، هو).

ئەمەش لە زماندا پێی دەگوترێت: (کەلیمە) [واتە: ڕستەی بەسوود و ماناهەڵگری تەواو]. وەکوو پێغەمبەری خوا دەفەرموویت: (كَلِمَتَانِ حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ) [٢] واتە: (دوو کەلیمە هەن خۆشەویستن لای "الرحمن" و سووکن لە سەر زمان و قورسن لەسەر تەرازوو ئەویش: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ).

یان دەفەرموویت: باشترین کەلیمە کە گوترابێت، کەلیمەی لەبیدی کوڕی ڕەبیعەیە کە دەڵێت: (ألا كل شيء ما خلا الله باطل) واتە: (هەموو شتێک جگە لە خوا باتڵە).

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ﴾ واتە: (ئەو بوختانەیان قسەیەکی زۆر گەورە و ناڕێکە کە لە دەمیان دەردەچێت). [الكهف: ٥].

---

(١) رواه مسلم.

(٢) متفق عليه

دەفەرمووێت: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلاً﴾ واتە: (فەرمان و فەرموودەکانی پەروەردگارت (ئەی محمد لەوپەڕی ڕاستی و دادپەروەریدا بە ئەنجام گەیشتووە). [الأنعام: ١١٥]. وێنەی ئەوانە لە قورئان و فەرمووده و کەلامی عەرەبدا کە وشەی (کەلیمە) بەکار هاتووە مەبەستی ڕستەیەکی تەواو و مانادار و بەسوودە.

هەروەکوو چۆن حەرفیان بەکار هێناوە لە بریی ئیسم گوتراوە: (هذا حَرْفٌ غريبٌ) واتە: (ئەم حەرفە غەریبە) حەرفیان بەکار هێناوە لە جیاتیی ئیسم. (سیبەوەیهی) کەلامی دابەش کردووە بۆ:

١. (اسم) ناو.

٢. (فِعلٌ) کردار.

٣. (حَرفٌ جاءَ لمعنى) پیتێکیش کە بۆ مانا هاتووە.

[سیبەوەیهی دەڵێت: (حَرفٌ جَاءَ لِمعنى)، نەیفەرموو: (حەرف) چونکە حەرف دوو جۆری هەیە: حروفی مەبانی و حروفی مەعانی.

جۆری یەکەم: حروفی مەبانی بریتییە لە حەرفە هیجائییەکانی زمانی عەرەبی، وەکوو: (أ= ئەلیف، ب، ج..، ی= یاء) ئەو حەرفانەی کە حەرفی مەبانییان پێ دەڵێن، وشەیەکی لێ دروست دەکرێت یاخود واتایەکی لێ دروست دەکرێت بۆ نموونە: (محمد) محەممەد: مەبنییە، پێک هاتووە لە چەند شتێک و لە چەند حەرفێک کە (م) و (ح) و (م)ـێکی تر و (د)ـە، ئەو حەرفانەی (محمد)ـیان پێک هێناوە پێیان دەوترێت چی؟ پێیان دەوترێت: حروفی مەبانی، حروفی مەبانی بە تەنها هیچ مانایەك نادەن بە دەستەوە، بۆ نموونە: کە (م) لە وشەی (محمد) بکەینەوە هیچ مانایەکی نییە، نە بە تەنها و نە لەناو ڕستەشدا.

جۆری دووەم: لە حروف چییە، حروفی مەعانییە، بزانین حروفی مەعانی چۆنە؟ بریتییە لەم جۆرە حەرفانە: (حروف جر) و (حروف مشبه بالفعل) وەکوو:

( إن و أن ولكـــن و لعـــل و ليـــت). ئەم حەرفـــانە حەرفـــن، بەڵام حەرفەكـــانی مەعانییان پێ دەڵێن، چونكە كە خرایە ڕستەوە، مانایەك دەدات بە دەستەوە. بۆیە حەرفەكان نە ناون و نە كردارن، هەر یەكێك لەم بەشانە پێی دەگوترێت حەرف. بەڵام تایبەتمەندیی سێیەمیان ئەوەیە حەرفە بۆ مانایەک هاتووە، نە ئیسمە و نە فـاعیلە. حـروفە هیجائییەكـان (أ- ب — ج -...) ئیسـمن، لە كاتێكـدا ئیسـمن. (وەرگێڕ)]

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت: (مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَلَهُ بِهِ حَسَـنَةٌ، وَالحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لا أَقُولُ الم حَرْفٌ، وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ وَلامٌ حَرْفٌ وَمِيمٌ حَـرْفٌ) واتە: (هەر كەسێك پیتێك لە كتێبەكەی خوا بخوێنێتەوە چاكەیەكی بۆ دەنووسرێت، چاكەش بە "دە" چاكەیە، مـن نـاڵێم "الـم" پیتـێكە، بەڵكوو "أَلِـف" پیتێكە و "لام" پیتێكە و "میم" پیتێكە).

هەروەكوو (الخليل بن أحمد الفراهيدي) پرسیاری كرد لە هاوەڵەكانی كە چۆن لە ناوی (زَيدٍ)دا، پیتی (زای) دەربڕن؟ هاوەڵەكان گوتیان: (زای)، (الخليل بـن أحمد) گوتی: (ئێوە ئیسمەكەتان گۆ كردووە (دەربڕیـوە) بەڵكـوو دەربڕینـی پیتـی (زای) لە (زەیدٍ)دا، بە (زَ) گۆ دەكرێت، كە ئێوە دەڵێن: (زای) ئەوە ئیسمە.

لە زاراوەی زمانزانان ئەوەی پێی دەگوترێت حەرف، پێی دەڵێن كەلیمە، "حەرف" تایبەتە بە هاتنی مانایەك، نە ئیسمە و نە فیعلە، بۆ نموونە وەكوو حروفی جەڕ. كەوابوو كەلیمە تەنها بۆ ڕستەیەكی تەواو مانادار هاتووە.

كەواتە مەبەستەكە ئەوەیە كە یاد و زیكری پەروەردگار بكرێت بە ڕستەیەكی تەواو مـانـادار، ئەوەش نـاو بـراوە بە كەلام. هەر ئەوەشـە سوود بە دڵ دەگەیەنێت و پاداشتی لەسـەر بە دەست دێت لای خوای پەروەردگـار، ناسـین و نزیكبـوونەوە لە پەروەردگاریش بەم جۆرە زیكرە بە دەست دێت كە لە قورئان و فەرموودەدا هاتووە.

یادی زیكری خوا بە ئیسمی موفرەد (الله، الله، هو، هو) هیچ بنەمایەكی نییە، چجای ببێتە زیكری تایبەتیی خواناس و عاریفان!

هۆکارێکیشە بۆ سەر سەرهەڵدانی کۆمەڵێک بیروباوەڕی خراپ، بەڵکوو ئەوە ڕێگەیەکە بۆ جۆرەها بیدعە و گومڕایی و سەرهەڵدانی بیروباوەڕ و حاڵی خراپ لە حاڵی ئەهلی ئیلحاد و ئەوانەی جیهان و خوا بە یەك شت حیساب دەکەن، وەکوو پێشتر ڕوونکرایەوە و قسەی لەسەر کرا.

# کۆکراوەی دین

کاکڵە و کرۆکی دین لە دوو بنچینەدا کۆکراوەتەوە:

١. هیچ شتێك نەپەرستین جگە لە خوا.

٢. بەم جۆرە بیپەرستین کە شەرعەکەی پێی ڕازییە و بۆی داناوین، نەیپەرستین بە بیدعە.

وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلا صَالِحًا وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾ واتە: (جا ئەوەی دەیەوێت بە دیداری پەروەردگاری شاد ببێت، بە خۆشنودییەوە با کاروکردەوەی چاک و دروست ئەنجام بدات و بە هیچ شێوەیەک لە پەرستندا هیچ کەسێک نەکاتە هاوەڵ و شەریک بۆی). [الكهف: ١١٠].

ئەمە تەحقیقی دوو شایەتومانەکەیە (شهادَةِ أَنْ لا إِلهَ إِلّا اللهُ، وشهادَةِ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ). شەهادەی یەکەم واتە هیچ کەس و هیچ شتێک نەپەرستین جگە لە خوا. دووەمیان واتە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵبژێردرا و نێردراوی خوایە پێویستە لەسەرمان بە ڕاستی بزانین و گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی بکەین و شوێنی بکەوین. پێغەمبەری خوا ئەوەی ڕوون کردووەتەوە بۆمان کە چۆن خوا بپەرستین و بەندایەتیی بۆ بکەین. ڕێگرییشی لێ کردووین لە داهێنراوەکان و هەواڵی پێ داوین هەر کەسێك داهێنان لە دیندا بکات، ئەوا گومڕایی و سەرلێشێواوییە.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿بَلَى مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِندَ رَبِّهِ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ واتە: (نەخێر وا نییە، هەرکەس بە

ڕاستی خۆی بداتە دەست خوا و لە هەمان کاتدا چاکەکار و موسڵمان بێت، ئەوە پاداشتی خۆی لای پەروەردگاری دەست دەکەوێت و نە ترسیان دەبێت و نە غەم و پەژارە دایان دەگرێت). [البقرة: ١١٢].

هەروەکوو چۆن فەرمانمان پێ کراوە کە لە هیچ کەس و شتێک نەترسین جگە لە خوا، پشت و پەنا و تەوەکوولیشمان هیچ کەس و هیچ شتێک نەبێت جگە لە خوا، تەنها خواش پارێزەر و پەناگەمان بێت، هیچی تر بە پارێزەر و پەناگە نەزانین تەنها خوا نەبێت. بەندایەتییشمان تەنها بۆ خوای پەروەردگار بێت، بۆیە فەرمانمان پێ کراوە گوێڕایەڵیی پێغەمبەری خوا بکەین و شوێنی بکەوین. بشێکەین بە پێشەنگ چاوساغی خۆمان، حەرام و حەڵاڵ تەنها ئەوەیە کە پێغەمبەر حەڵاڵی کردووە یان حەرامی کردووە، دینیش ئەوەیە کە ئەو هێناویەتی، خوا دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُواْ مَا آتَاهُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللَّهُ سَيُؤْتِينَا اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَرَسُولُهُ إِنَّا إِلَى اللَّهِ رَاغِبُونَ﴾ واتە: (خۆ ئەگەر ئەوانە ڕازیبوونایە بەو بەشەی خوا بە نسیبی کردوون و پێغەمبەر پێی بەخشیون و بە دڵ بیانوتایە: خوامان بەسە (کە لێمان ڕازی بێت)، ئێمە فەرامۆش ناکات لە ئایندەدا هەر پێمان دەبەخشێت لە فەزڵ و زیادەڕێزی خۆی، پێغەمبەرەکەشی لەوەی دەستی دەکەوێت پێمان دەبەخشێت، بە ڕاستی ئێمە ئاوات و مەبەستمان گەڕانەوەیە بۆ لای خوا و بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی ئەوە (ئەو کاتە پاداشتی هەردوو جیهانییان بۆ خۆیان مسۆگەر دەکرد). [التوبة: ٥٩].

دەفەرمووێت: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا﴾ واتە: (جا ئەوەی پێغەمبەر پێی بەخشیون وەری بگرن، هەر فەرمانێکی پێ دان، بە گوێی بکەن، قەدەغەی هەر شتێکی لێ کردن، مەیکەن). [الحشر: ٧].

پەروەردگار واجبی کردووە کە تەنها پشتبەستن لەسەر خۆی بێت و تەنها پشت بەو ببەستن ﴿وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللَّهُ﴾ واتە: (بە دڵ بیانوتایە: خوامان بەسە (کە لێمان ڕازی بێت). [التوبة: ٥٩].

خوای پەروەردگار نەیفەرموو: پشت بە پێغەمبەریش ببەستن.

وەکوو لە وەسفی هاوەڵاندا لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرمووێت: ﴿الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ واتە: (ئەوانەی کە خەڵکی (باوەڕ لاواز) پێیان دەڵێن: بە ڕاستی خەڵکی بێباوەڕ و خوانەناس خۆیان بۆ ئێوە کۆکردووەتەوە و خۆیان بۆ ئێوە مەڵاس داوە، لێیان بترسن (خۆتان تووشی بەڵا مەکەن) بەڵام ئەوان (واتە ئیمانداران بەو پڕوپاگەندەیە) باوەڕیان دامەزراوتر بوو، وتیان: خوامان بەسە کە یاریدەدەر و یارمەتیدەرێکی چاکە). [آل عمران: ١٧٣].

دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللَّهُ وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: (ئەی پێغەمبەر تەنها خوا بەسە بۆ خۆت و ئەوانەی شوێنت کەوتوون لە ئیمانداران کە پشتگیر و یاریدەدەرتان بێت). [الأنفال: ٦٤].

پاشان دەفەرمووێت: ﴿سَيُؤْتِينَا اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَرَسُولُهُ﴾ واتە: (ئێمە فەرامۆش ناکات لە ئایندەدا هەر پێمان دەبەخشێت لە فەزڵ و زیادەڕێزی خۆی، پێغەمبەرەکەشی لەوەی دەستی دەکەوێت پێمان دەبەخشێت). [التوبة: ٥٩].

خوای پەروەردگار وای داناوە کە بەخشین بۆ خوا و بۆ پێغەمبەری خوایە، باسی فەزڵی خوایشی پێش خستووە، چونکە فەزڵ و بەخششی خوا هەمووی لە دەستی خوادایە، دەبەخشێت بە هەر کەسێك بیەوێت، پەروەردگار خاوەنی بەخشش و فەزڵی زۆر گەورەیە، فەزڵ و بەخششیشی هەیە بەسەر پێغەمبەری خوا و ئیمانداران ﴿إِنَّا إِلَى اللَّهِ رَاغِبُونَ﴾ واتە: (بە ڕاستی ئێمە ئاوات و مەبتستمان گەڕانەوەیە بۆ لای خوا و بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی ئەوە (ئەو کاتە پاداشتی هەردوو جیهانییان بۆ خۆیان مسۆگەر دەکرد). [التوبة: ٥٩].

پەروەردگار تەنها ڕەغبەتی بۆ خۆی داناوە، وەکوو دەفەرمووێت: ﴿فَإِذَا فَرَغْتَ فَانصَبْ * وَإِلَى رَبِّكَ فَارْغَبْ﴾ واتە: (جا کاتێك لە کارێکی خێر دەبیتەوە، خۆت ماندوو بکە بە کارێکی خێری ترەوە * با هەمیشە و بەردەوام حەز و ئارەزووت بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا بێت، بەردەوام خەڵکیش هان بدە تا پەروەردگارت بناسن و لە هەوڵی ڕەزامەندیی ئەودا بن). [الشرح: ٧-٨].

پێغەمبەری خوا بە (ابن عباس) دەفەرمووێت: (إِذا سَأَلتَ فاسأَلِ اللهَ وإِذا اسْتَعَنْتَ فاستَعِنْ باللهِ). واتە: (ئەگەر داوای شتێکت کرد، ئەوا تەنها داوا لە خوا بکە، ئەگەر پشتیوانیت ویست، ئەوا تەنها پشت بە خوا ببەستە). بۆیە لە چەندان شوێنی تردا لە قورئان بەڵگەیە لەسەر ئەوە.

خوای پەروەردگار دایناوە کە بەندایەتی و ترسان و خۆپارێزی لە تاوان تەنها بۆ خوای گەورەیە، بەڵام گوێڕایەڵی و خۆشەویستی بۆ خوا و پێغەمبەری خوایە.

هەروەکوو لە قسەی پێغەمبەر نوحدا هاتووە دەفەرمووێت: ﴿أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ﴾ واتە: (داواتان لێ دەکەم کە: هەر خوا بپەرستن و لە خەشم و قینی، خۆتان بپارێزن و فەرمانبەرداری منیش بن). [نوح: ٣].

دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَخْشَ اللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾ واتە: (جا ئەوەی فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەرەکەی بکات و لە خوا بترسێت و لەسەرپێچی و نافەرمانیی خۆی بپارێزێت، جا ئا ئەوانە سەرفراز و بە ئاوات گەیشتوون). [النور: ٥٢]. وێنەی ئەم ئایەتانە لە قورئاندا.

هەموو پێغەمبەران فەرمانیان پێ کراوە بە تەنها خوا بپەرستن و تەوەکولیان تەنها بە پەروەردگار بێت و گوێڕایەڵیی بکەن، شەیتان نەساڕاکانی گومڕا کرد و وایلێکردن هاوەڵ بۆ خوای گەورە بڕیار بدەن، دژایەتیی پێغەمبەرەکانییشیان بکەن، پیاوانی ئایینی و پیاوچاکانی خۆیان

دەپەرست و حەرام و حەڵاڵیان لەوان وەردەگرت و تەوەکولیان لەسەر ئەوان بوو بۆ لای ئەوانیش دەگەڕانەوە، بەڵام خوا ئیماندارانی ڕێنموونی کردووە بۆ سەر حەق، ئەوانەی کە حەقیان ناسی و شوێن حەق کەوتن، ئەوانەی دڵسۆز و ڕاستگۆ بوون لەگەڵ خوا و جگە لە خوا هیچ کەس و هیچ شتێکیان نەدەپەرست.

ئیمانداران لەوانە نەبوون کە خوا خەشمی لێ گرتن و نە لەوانە بوون کە گومڕابوون، بەڵکوو ئەوانە دڵیان خاڵس کرد بۆ خوا و بۆ دینی خوا، تەسلیمی پەروەردگارییشیان بوون. بە دڵ و جەستە ئەوان خوایان خۆش ویست و گەڕانەوە بۆ لای، لێی ترسان و گوێڕایەڵییان کرد و تەنها داوایان لەو دەکرد و پشتیان هەر بەو دەبەست.

گوێڕایەڵیی پێغەمبەرییشیان دەکرد و پشتیوانی پێغەمبەرانیان کرد و بە گەورەیان زانین و پێغەمبەرانیان خۆش دەویست و پشتیوانییان دەکردن و دۆستایەتیی پێغەمبەرانیان دەکرد.

شوێن پێغەمبەران کەوتن و بە نوور و ڕووناکیی ئەوان ڕێیان دەکرد و شوێن نووری پێغەمبەران کەوتن، ئەمە ئەو دینی ئیسلامەیە کە سەرەتا و کۆتاییی پێ ناردووە لە پێغەمبەران، ئەو دینەشە کە خوا وەری دەگرێتەوە، هیچ دینێک وەرناگرێت لە هیچ کەسێک تەنها ئیسلام نەبێت.

ئەمەش حەقیقەتی بەندایەتییە بۆ خوای جیهانییان و کارجوان و کاربەجێ.

داواکارم لە خوا دامەزراومان بکات لەسەر ئەم دینە و لەسەر ئەم دینەش بمانمرێنێت.


ناوەرۆك

# بەندایەتی

لەم کتێبەوە:

- ئیخلاس (بەس خوا مەبەستبوون) قەڵغانێکە مرۆڤ لە کەوتنە ناو گوناهان دەپارێزێت.

[كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ] (یوسف: 24)

- ڕێگەی سێیەم بوونی نییە، ئەگەر مرۆڤ نەبێتە بەندەی خوا، ئەوا دەبێتە بەندەی ئارەزووەکانی!

- ئەو کەسەی دڵسۆزە بۆ خوا، تامی ئیمان دەچێژێت. ئەم چەشتنە ڕێگریی لێ دەکات دڵی بە فیرۆ بدات بۆ جگە لە خوا.

- کۆیلەبوونی دڵ، زۆر گەورەتر و مەترسیدارترە لە کۆیلەبوونی جەستە.

- کاتێک مرۆڤ دڵی پەیوەستە بە غەیری خواوە و دڵی جێگیر نییە لەسەر بەندایەتی بۆ خوا، ئەوا هەمیشە دروستکراوەکان دەبنە جێی ئومێدی ئەو! چەندێک خۆیشی بە ئاتاج و پێویست بزانێت لە بەرانبەر دروستکراواندا، ئەوا بەو ئەندازەیە بەندایەتی بۆ غەیری خوا لەم مرۆڤەدا سەوز دەبێت و سەر هەڵدەدات!



نرخی 4.000 دینار
9 789922 733043

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
/TafseerOffice
+964 750 818 08 65
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com